# ئاهووی ئێڵاخان

## شیعر



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان:

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

www.araspublisher.com

# ÊÙšx}z ÍËu¼Ùz

## بەرگی یەکەمی دیوانی

## عابد سیراجەدین نەقشبەندی

ئامادەکردنی: ئەسعەد سیراجەدین نەقشبەندی



ناوی کتێب: ئاهووی ئێلاخان
دیوانی عابد سیراجەدین نەقشبەندی: بەرگی یەکەم
ئامادەکردنی: ئەسعەد سیراجەدین نەقشبەندی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢٩٧
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب + حاجی دلاوەر سادق
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: محەمەدی مەلا کەریم + شێرزاد فەقێ ئسماعیل
هەڵەگریی سەر کۆمپیوتەر: عەزیز عەبدولخالیق
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٢٨٠)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

## پێشەکی

ئیــلاهی، خــالقی هەســتی! بە کــام ڕوو بێــمــە دیوانت
کـە دامنێی بەش، لە ڕیزی کـەمـتـەرین بەندەی بەئیـمـانت
لە کـام تاوان بلّـێم ببـەخشـە، تۆبەم بێ، بەڕەحمی خـۆت
کـەرەم کۆلاو! دەخـیلم، سـەد دەخـیل، خـۆم خسـتـە ئاسـانت

پێشـەکی نووسین بۆ دیوانی دوکـتـۆر عـابد سراج الدینی نەقشـبـەندی گـەلێ سـەخت و دژوارە، دەریاییێک هەستی جوان و تەبعـێکی خرۆشانـتر لە تۆفان چلۆن لە کورتە باسـێکا جێی ئەبێـتـەوە. تەنهـا بەو نەزیلە دڵ خـۆش ئەکـەم کـە مـشت نموونەی خـەرواره، سـاڵی ١٩٢٣ دوکتۆر عابد لە ئاوایی دوڕۆی هەورامان لەدایک بووە، بەپێی ڕەوشتی بنەماڵە لە تەمـەنی (٦) سـاڵـیدا ڕێی قوتابخانەی ئاییـنی گرتەبەر وە بەهۆی زیرەکی و هۆشـیاری وە خۆشەویسـتی مـامـۆسـتـاکـانی ئەو سەردەمـەی خـانەقـای دورۆ و بیـارە بوو، دوکتـۆر عـابد کوڕەزای شێخ علاءالدین و کچە زای شێخ نەجمـەدینی بیـارەیە، لە تەمـەنی نەوجەوانیـدا لەلای شێخ محـەمەدی خۆراسانی و پاشان مامۆستا مەلا عـەبدولکەریمی مودەڕس و مەلا بەها لە خـانەقـای بیـارە دەرسی خـوێندووە، هەر لە سـەردەمی نەوجەوانیـدا بیر و هەسـتی نەتەوایەتی تەنگی پێ هەڵـئـەچنێ و ڕوو ئەکـاتە مـەشخـەڵی گەش و پڕ نووری جمـهوری جوانەمەرگی مهاباد.

لە شیعرەکانیا ئەم هەستە بەوردی ئەکەوێتە پێش چاو وە دیارە کە ئەو عاشق و شەیدای نیشتمانە، وە ئازادییش مەبەستی نیهائی ئەو شاعیرە پایەبەرزەیە:

سـەرم پڕ بوو لە سـەودا، داخـەکـەم هیـچم نەهێنادی
لە گـشـتی پڕ بەهاتر بوو، بەلامـۆ، گـەنجی ئازادی

دوکـتـۆر عـابد پاش گـەڕانەوە لە (مـهـاباد) بۆ ئەوەی بتـوانێ بڕواتە ڕیزی قـوتابیـانی مەدرەسە و مـەکتەبی نوێی ئەچێ بۆ کەرکووک، بەڵام پێش ئەوەی قوتابخـانەی ناوەندی تەواو کـات بەهۆی هەندێ ڕووداوی بنەمـاڵە و پەیوەنددار لەگـەڵ مـەسـئـەلەی سیـاسی ئەو سەردەمـەدا لەگەڵ باوکی و بنەمـاڵەدا ڕۆ لە ئێران ئەکەن وە پاشان لە دوڕۆ جێگیـر ئەبن، سەردەمێک بەکشـتوکاڵ و زەراعـەتەوە مەشغول ئەبێ پاشان لە دوڕۆ بـار ئەکەن و ئەڕۆن بۆ





قەلا شێخـان ناوچەی کـەلاتەرزانی سـەر بە سنە، بەڵام هەرگـیز لە کـتێب و مـوتالەعە دوور ناکـەوێتـەوە، کـۆچا و کـۆچ و دەربەدەری، ئارەزووی زانسـتی و گـەیشتن بەپلەی عـیلمی هەستی ئەو ناپسـێنێ، بەڵکە ئەو بڕوایە دەمـەزرد ئەکـاتەوە، وە بۆ گەیشتن بەئامانج ڕێی ئەکەوێتە کۆڕی زانایان و پیاو مـاقوڵانی سنە، و هەر لەوێوە ڕێ پەیدا ئەکا بۆ درێژەپێدان بەخوێندن وە سەرئەنجام لە دانشگای (ئیلاهیـات)ی تاران وەرئەگیرێ، شیعر بەشێکی پڕ بەهایە لە ژینی دوکـتۆر عـابد، ئەگەرچی لە زانست و ئەدەبی کوردی و فـارسیـدا دەستێکی باڵای هەبوو، بەڵام هەرگـیـز لە بەرابەر غـروور و خـۆ بەزل زانینەوە تەسلیم نەبوو، بۆیە ئەڵێ:

مۆتالای ڕێزەکاریی کردگار کەی سەهل و ئاسانە
ئەوی لەو فەننەدا پێی وا یە زۆر ئوستادە، نادانە

دوکتۆر عابد لەگەڵ ئەوەدا کە دەرسی ئەخوێند لە ڕۆژنامەی کوردستاندا نووسەر بووە و هەروەها لە ڕادیۆی کـوردی تـارانیش کـاری ئەکرد، زۆربەی نووسـراوەکـانی لە ڕۆژنامـەی کـوردسـتـان تامـوبۆنی کۆمـەڵایەتی و ئەدەبی هەبوو تا سیـاسی، لە تەمەڵی و بێ کـاری زۆر بێزار بوو و هەمـیـشـە نێشی قـەڵەمی پڕ بوو لە تەوسوتوانج بۆ ئەو کـەسانەی وا لەژێر کـار دەرئەچن و ملپێچی ئەکەن:

داد و فــەریاد و سکاڵا مــەسلەکی بێ کــارەیە
مــۆنە مـۆن دانـان لە عــالەم کـردەوەی پەتیــارەیە
ڕاپەڕە وەک شـێـر بەرەنگاری مـەشـاکـیل بەو برۆ
هەر کـە تەن دەردا بەخواری عـاقیـبەت بێچـارەیە

لە زۆربەی شیـعـرەکـانیـا تامـو چێشـگەی عـیشق و ئەوینی ڕاسـتـەقینە بەدی ئەکرێت و ڕەنگە سەرچاوەکەی بگەڕێتـەوە بۆ پەروەردەی سەردەمی منداڵی و لایەلایەی دەمی بێشکە کە هەر هەمـان زیکر و ویرد و سەیر و سلوکی عـارفانە و سۆزی سۆفـیـانە بووە. ئەم سۆزە لەم شیـعرەدا بەدی ئەکرێ کە بۆ شێـخی تەریقـەتی نەقشبەندی حەزرەتی شێخ عوسمـانی مامی نووسیوە:

قــوربانە فــیــدای تەکــیــە نشــینانی جــینانم
شـەیدام مـەکـە لۆمـەی شـەرەری شـۆر و فـوغـانم
لەو کــاتەوە دوورم، لە جـەمی حـەڵقـەیی ذیکرت
دڵتـەنگ و مـەلوول و پەکـەر و خـەسـتـە ڕەوانم

ئەی هوو! لە کەیو ئەم دڵە شەیدایە ئەڵێ من
غەوغای دەمی مەجذووبە دەوا و مەرهەمی گیانم

دووری و تەنیایی و ئاوارەبوون دڵە ناسکەکەی شاعیر ئەخاتە ژێر مەنگەنەی هەزاران پرسیاری بێ وەڵام، ئەگەرچی بە تێروتەسەلی ئەژیا وەگەرچی خاوەن ڕێز و احترامە لەناو هاوسەر و هاو ماڵ و خەڵکا، بەڵام هەر مەلوولە، هەر خۆی بەتەنیا ئەبینێ و دڵی هەر قرچەی دێ بۆ گەلەکەی و ئاواتی لە گەرووخنکاوی.

تەواو بوو عومر و ژین، تازە خەریکی پایەدانانم
بەبیرما قەت نەهات ڕۆژێ کە ئامانەتم و مێهمانم

مەستی مەی و بادە بووە تا بووە سەرچاوەی شیعری شاعیرانی کلاسیک و سۆفی سینە ساف و خاوەن ناوونیشان بووە.

لە شیعرەکانی دوکتۆر عابد متخلص بە(هێژا) گەلێ جار باسی مەی و مینا ئەکەوێتە پێش چاو:

مەکەن لۆمەی ئەوی مەست و خەرابە
جگەر بوریان، دڵی داغە و کەبابە
لە بازاڕی کەسادی شۆری مەستا
تەن و گیان، قیمەتی جامێ شەرابە
لە خومخانەی هەوادا لانە بگرە
وەفادار و فیدایی و بێ ڕێیا بە
بە یادی نەرگسی شەهلا خۆمارۆ
بەرەو مەیخانە چوون بێ شک سەوابە

شاعیری هەست ناسک و نیشتمانپەروەر دوکتۆر عابد هەندێ جاریش زاهدی ڕیائی ئەخاتە بەر تەوسوتوانج و، پاشان بەشێوەیەکی شاعیرانە و عارفانە لۆمەیان دەکا و ئەڵێ:

ئەگەر ڕازی مەی و مینا بزانێ زاهیدی مەغروور
بە تاوی تاسە گڕ ئەگرێ، بە سۆزی سینە دووراودوور
ئەمان لەو کاتە وا هەڵچێ و بجۆشی خۆمرەیی ساقی
لە کۆی فێنک ئەبێتۆ وا خرۆشێ، بۆ شنۆی کافوور



هەستی ناسکی شاعیرانەی دوکتۆر عابد ناتوانێ لە شیبی شەلاخی زاڵم بێ بەش بێ، ناتوانێ غەم خۆری هەژار و داماو نەبێ، ناتوانێ دەردی کۆمەڵ بەدەردی خۆی نەزانێ، بۆیە بە هەستێکی پڕ ئێشەوە، بە نالەیەکی پڕ خرۆشەوە تێکەڵ بەپاڕانەوە، لە دەرگای باری ئەڵێ:

شەقەی شەللاخی زاڵم دێ
زەلی کام چەم بەسەرما کەم
تەقەی تێلای ستەمگەر دێ
بەرەو کام مەملەکەت ڕاکەم
خەیاڵ و ئارەزووی بێ جێ،
هەڵەی هەڵناوە بێ پەردە
تەرەس شاتاڵی هێناوە
بە کام دەسمایە سەر داکەم

ئافرەت و جوانییەکانی چەندە سەرنجی شاعیری ڕاکێشاوە، هێندەش ئەو ستەمەی وا هەست و هەناوی ژنی ژێر پێ کردووە جێی سەرنجی شاعیرە، لەهەمان کاتدا شێرەژن سەربەندی گەلێ لە شیعرەکانی دوکتۆر عابدە:

دە سەیری بەژن و باڵای کەن ئەڵێی سەروی گولستانە
سەرنجی دیمەنی مایەی ژییان و شێرەژن جوانە
تەماشای زلفی ئاڵۆزاو بەهەر حەلقەی دڵێ بەندە
بەسەرشان و سەرو ملیا کە پەخشان و پەرێشانە

هەروەک وتم غەمی سەرتاسەری ژینی ئەم شاعیرە پایەبەرزە لە چوارچێوەی گەل و هۆزی تێپەڕ ناکا، جا ئەگەر کۆسکەوتوویێک هەنسکی بۆ مەرگی کەسێک یان لاوێکە، هەنسکو قوڵپی گریانی دوکتۆر عابد بۆ هەڵەبجەی شەهید ئەگاتە دوا پلەی خۆی.

وە پاشان ڕەوەکەی کوردستان و ئەو هەموو نالەباری و غەم و کۆسکەوتنە ئەبێتە سەرچاوەی غەزەلێکی پڕ تین و تەوژم کە پیتی هەر شیعرێکی سێڵاوی فرمێسکی جگەر تاوێنە:

های کۆس، های کۆتەل، های شین و زاری
های سۆزەی فۆغان، های دەردی کاری

های ڕۆ، های فیرار، های طوفان، های تەم
های مەینەت، های خەم، هەیاهووی ماتەم

ڕۆژانی ئاخری عومری دوکتۆر عابد تێکەڵ بوو لەگەڵ ماتەمێکی دڵ تەزێندا کە باڵی بەسەر خاکی پیرۆزی کوردستاندا ڕاکێشابوو، هەموو شتێ شاراوە، هەموو شتێ نادیار، بڕوا جێی خۆی گۆڕیبوو بە وەهم و خەیاڵ، ئارەزوو تەنانەت لەسەر لێویش هەڵفڕیبوو، پیر و جوان بێ تەفاوەت کۆسکەوتوون، هەموو شت لە غەما خۆی دەنوێنێ.

شاعیر ڕۆژێ بۆ هەڵەبجە ڕەشپۆشە و غەمبار، وە ساتێکی تر غەمی قەرەداغ هەست و هەناوی تاور تێ بەرئەدا و، لە هەمان کاتا گەرووی بەسراوە و هاواریشی بەکەس ناگا:

داغی قەرەداغ داغە چلۆن هێدی دەبێتۆ
جۆشی دڵە یا ساغە لە کوڵ نابێ بچێتۆ
نەنگێکە بەپێشانیی ستەمکارەوە فەرزە
تا ڕۆژی قیامەت، لە پەسا تازە کرێتۆ

ساڵی ١٩٩٥ لە کاتێکدا دەر و دەشتی کوردستانە جوانەکە و هەورامانە ڕەنگینەکە تازە ببۆوە، مەیدانی لەشکر ئارایی تیپی گوڵاڵە سوورە و حەریری سەوزی ڕێحان و هەزبێ و شەوبۆ فەرشی ڕێی دڵ دۆڕاوان بوو، هەستێرەیێک لە ئاسمانی ئەدەبی کوردی بەرەو دنیای نەبوون کشا، چرای ژینی شاعیرێ کوژایەوە، ماتەمێک لە بری جەژنانەی نەورۆز وەک هەرەس داوێنی بنەماڵەی نەقشبەندیی گرت، دوکتۆر عابد لە ڕۆژی ٨ی مانگی نەورۆزی ١٩٩٥دا کۆچی دوایی کردیی دەردی غەریبی دیسانەوە بوو بەسرودی سەرزاری ئەدەب دۆستان، دوکتۆر عابدی غەریب لە شاری (ریاض) پایتەختی عەربستانی سعودی لە دونیا دەرچوو و هەر لەوێش ئەسپەردە کرا. دوکتۆر عابد لەگەڵ زەینەب خانم کچی حاجی ئەحمەدی ستوودە لە بنەماڵەی سەیدەکانی بائین چۆ ازدواجی کردووە کە ئەویش هەر لە شاری ڕیاض کۆچی دوایی کردووە. دوکتۆر عابد (٤) منداڵی لێ بەجێ ماوە کە بریتین لە دوو کوڕ و دوو کچ (عەزیز، ناسر، ثریا، گوڵاڵە).

دوکتۆر عابد لە شیعری کلاسیکدا بەبۆنەی دەسەڵات بەسەر سەنعەتی شیعریدا تەوانایی و هێزێکی بەربڵاوی نواندووە، ئەو لەسەر کێشی نوێش شیعری وتووە کە تامو بۆنو ئاهەنگێکی جوانی تێدا بەدی ئەکرێت، شیعرە هەورامیەکانی هەڵقوڵاوی هەستی خۆشەویستین سەبارەت بە بەروبوومی هەورامان. دوکتۆر عابد لەناو شاعیرە



فارسەکانیشدا ناسراوە، شیعری فارسی ئەم شاعیرە لەکاتی خۆیدا جێی باسی لێکۆڵەران و ئەدیبانی فارس بوو، دیوانی شیعرە فارسییەکانی تێروتەسەل و پڕ مانان وە هەموو چەشنە شیعرێکی تێدا بەدی ئەکرێت بەتایبەت خۆشەویستی، بەتێکڕا (٥) دیوانی هەیە یەکێ لە دیوانەکانی گۆرانییەکانن کە بۆ گۆرانی بێژانی کورد و فارسی ئەو سەردەمەی ڕادیۆ تارانی داناون وەک هونەرمەند مەزهەری خالەقی، دوکتۆر چەن مانگێ پێش لە مەرگی هات بۆ لەندەن بەو هیوایە کە بتوانێ دیوانەکانی چاپ بکات و بیخاتە بەرچاوی خوێنەر، بەڵام هەیهات! دەردی هەموو ڕێبوارێ وەنەوزە، پاش مەرگی دوکتۆر عابد من وەکو براییێک هەمیشە بیرم لەوە ئەکردەوە کە ئاواتەکەی بەجێ بێنم. منداڵەکانیشی هەر ئەم ئارەزووەیان لەسەر بوو تا هەلێک دەستی دا و لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٢دا یانێ نزیک بە(٧)ساڵ پاش مەرگی دوکتۆر عابد من ڕێم کەوتەوە کوردستان... کوردستانی جوان، ئەو خاکە پیرۆزە کە دوکتۆر عابد خەونی ئازادی و سەربەستی پێوە ئەدی، ئەو خاکە کە دوکتۆر عابد بە کلەی سوبحانی یان بە جەواهێر سورمە ناوی ئەبا، دوکتۆر عابد نەماوە تا ئەو ئەزموونی ئازادی و دیموکراسییەی کە ئێستە لە هەرێم لە شاری قەڵا و منارە لە هەولێر بەڕێوە ئەچێ ببینێ، لە بەرنامەی بەچاپ گەیاندنی نووسراوەکانی دوکتۆر عابد ڕێم لە دەزگای (ئاراس) کەوت دامودەزگایێک کە بەخزمەتکردنی ئەدەب و وێژەی کوردییەوە ئەناسرێت، وە گەلێ دڵسۆزانە هەنگاو هەڵئەگرێ بۆ بڵاوکردنەوەی شوێنەواری نووسەران و ئدەبای کورد، دەزگای (ئاراس) خۆشبەختانە ڕووی بۆ چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی بەرگی یەکەمی دیوانەکەی دوکتۆر عابد پیشان دا. لێرەدا بەش بەحاڵی خۆم و بنەماڵەی مەرحوم دوکتۆر عابد سپاس و ڕێزی بێ پایان ئاراستەی دەزگای ئاراس و هەموو ئەو کەسانەی ئەکەم کە بە ئەرکی پیرۆزی چاپکردن و بڵاوکردنەوەی ئاثاری شوعەرا و نووسەرانی کورد هەڵئەسێن، دوعای خاسانی خودایان لەسەر بێ.

ئەسعەد سیراجەدین (نقشبندی)
٢٠٠٢/٢/١٢

## پایەی ستەم

ئیلاهی، خالقی هەستی! بە کام ڕوو بێمە دیوانت
کە دامنێی بەش، لە ڕیزی کەمتەرین بەندەی بەئیمانت
لە کام تاوان بلێیم ببەخشە، تۆبەم بێ، بە ڕەحمی خۆت
کەرەم کۆلاو! دەخیلم سەد دەخیل، خۆم خستە ئاسانت
بەجێم هێنا ئەوی نەفسم حەزی لێ کرد و لێی ویستم
خودا! تۆبە. پەنام کوانێ، بە غەیری عەفوو غوفرانت
مەگەر لافاوی ڕەحمت بێت و دایشۆرێ گوناهانم
بەتاو ڕاپماڵێ تاوان و قوسووری عەبدی نادانت
نەجاتم بێ، لە ئەو تالّووکە ڕزگار بم بە ئەمری خۆت
چ ئاگاداری دامەزراوە ئیمانم. بە قورئانت
ئەگەرچی نەفسی ئەممارەم بڕێ سەرکێشە جاروبار
دەزانی زوو خەجالەت ئەیگرێ بەندەی پەشیمانت
تەماداری گوزەشتم، یاڕەحیم، ئامانە ببەخشە
پەشیمانم کە سەرپێچیم فراوانە لە فەرمانت
نیازمەندی شەفاعەتتم، دەخیلە سەییدی سەروەر
(رسول الله) دە فریای من کەوە! ڕۆحم بەقوربانت
«ولاتقنط» دەخوێنم، سووسەیی هیوامە مەولای من
بەرەو ڕووم لاوەکە، قوربان، ئەتۆ و ئیخلاصی یارانت
دەسا (هێژا)! بەئومێدی شکۆی پشکووتنی غونچەی
هیوا، سەرکز کە، ملکەچ، تا بەکاربێ شین و گریانت



## لەگەڵ بڕیارم

تەواو بوو عومرو ژین تازە خەریکی پایەدانانم
بەبیرما قەت نەهات ڕۆژێ کە ئامانەتم و میهمانم
ئەگەر گاهێ بەبیرما ڕابوورد، ئێرە بەجێ دێڵم
لەبەر خۆمۆ وتم هێشتا زووە، بێ خود هەراسانم
ئەوە غەیری فەریبی زەرق و بەرق نابێ شتێ تر بێ
لەقەس خۆم ئەخلەتێنم، کارێ بێ جێیە بەویجدانم
سەرایێ فانییە بێ شک، بەجێیدێڵم ئەڕۆم کاتێ
لە گەڵ بڕیام و کۆچم چوو، لە کەردەی خۆم پەشیمانم
بنەو بارگەم نەپێچایۆ، بە بێ تۆشە لەوێ دەرچووم
دڵم پێوە نەبوو هەروا بەجێیی بێڵم بەئیمانم
بەڵام یاران ئەوەی ڕاستی بێ بێ عارە بەنی ئادەم
لە زۆر شت تێ ئەگا و گێلانە ئەڕوا و ئێژێ نازانم
ڕەفیقان ئەم جەهانە، بۆ کێ دایم مایەوە، بێژن
چییان لێ هات عەزیزانم، لەکوێن دۆستان و یارانم؟
ئەمانە گشت ئەزانین و پەزیرایە و[١] هەمووی ڕاستە
بەڵام داخی بەجەرگم لێرە سەختین[٢]، ماڵی وێرانم
کە وەختێ بەرگی تەسلیمی لە بەرکریا و نەماچارێ
ئەلالێمۆ بەکوڵ، ئێژم ئیلاهی سەربە فەرمانم
وەصییەت بێ لەسەر کێلم بنووسن باقی ئەم شیعرە
کە بەشکەم لێم ببورێ، بێ نەوام موحتاجی ئیحسانم
خوداوەندا! لە بەندەی بێ نەوا پاڕانەوەی ڕاستی
کە تۆش بەخشینی بەندەت پێ شییاوە کانی غوفرانم
پەیامبەر! شافیعی ئوممەت! لە ئێستا تەنگترم نابێ
وەرە فریام کەوە قوربان، هەژارم، دەس بەدامانم

پەنایێکم نییە، شای بێ کەسان فریام کەوە، زارم
ڕەسوولی خوا! شەفاعەت کە، گەلێ خەستە و پەرێشانم
مەجالّم تەنگە پیرانی طەریق! پاڕانەوەم چۆن بێ؟
ئەبێتە باعیشی عەفوی گوناهانی فراوانم
بەخۆت تەسلیمە (هێژا)و،خاکی ژێرکەوشی ڕەسوولانت
خولّامی خێلّی عیرفانت، موریدی پیری پیرانم

---

(١) پەزیرایە: مەقبوولّە. (٢) لێرە سەخت: سمج و کۆل نەدەر و بێ عار.



## مەلی مەلەکووتی

ئەو مەلەم وا لە بەهەشتی مەلەکووتا[١] ئەفڕێ
بە هەوای مەتلّەبێ[٢] ئەڕوا کە لەوێ پێی بدرێ
بە نەوای خۆشی شنەی شاپەڕی بالّی نەرمی
گەرد و خاکی غەم و خاشاکی دەروونی ئەسڕێ
دەمی ئەفسونگەریی کاتێ سەر ئەدا ڕاز و نیاز
هێندە گیرایە بە ئاوایی نەوای دلّ ئەگرێ
ئەونە تیژبالّە لە ڕاوی مەلی شەیدای بەزما
بەپەڕی بالّی بەئاسانی نەچیر ڕائەبڕێ
سەیری گەڕیانی لە ئافاقی[٣] سەمای دلّخوازی
حیرەت[٤] ئەنگێزە پەلاماری لەپڕ هەلّئەفڕێ
چاو لە دووی زۆرە، حەسوودانی بەدوویا وێلّن
چاوەزاری لە قەزا فەرزە کە گوێی پێ بدرێ
تەیری ئافاقی سەفاڕاوی مەحالّە بێ شک
هێندە چالاک و خەتەرناکە بەدەم ناوترێ
ئەوی بێ باکە وەها چاکە لە بەزم ئەو دەر بێ
شۆڕی شۆریدە ئەسووتێنێ دەمێ گڕ بگرێ
سابرۆ بالّی هەوالّی دە بە ئاهەنگی وەفا
سەرەڕێی (طائر)ی (هێژا) بەجەفا نابەسرێ

---

(١) بەهەشتی مەلەکوتی: بەهەشتی ملائیکەیی. (٢) بە هەدەفی گەیشتن بەمەتلّەبێ: بەهەوای مەتلّەبی.. (٣) ئافاق: ئاسۆکان. (٤) حیرەت ئەنگیز: تەعەجوب هاوەر.

## بازی خەیاڵ

ساقی قەدەحم[1] پڕ کە، پەرێشانە خەیاڵم
لەو خومرە کە نەشئەی گڕەدا بیری بەتاڵم
ئەوکاتە بە کەیفی دڵی خۆم، باڵ ئەوەشێنم
بێ پەردە لەگەڵ حوور و مەلەک، هاوپەڕو باڵم
بای باڵ ئەدەم ئەو ساکە لەگەڵ پۆلی پەریدا
زۆر گەرمە هەرای ساز و سەمای مەجلیسی قاڵم[2]
بێ باکم و سەرخۆشم و سەوداسەر و مەستم
شابازی سەراسۆی گەڕەکی پوختە[3]و و کاڵم[4]
لەو جەرگە کە کۆن ئەهلی دڵ و سۆزش و سازش
گوێ بگرە لە ئاهەنگ و نەوای سازی زەراڵم
مەستانی خەراباتی بە ئاوای[5] دەمی گەرمم
پێ خاوس و سەرگەشتە ئەچن تادەری ماڵم
هاوبەزمە لەوێ خورد و کەلان[6]، عابید و عاریف
کاتێ کە ئەنرکێنێ دەفی کوورەیی حاڵم
ئازادم و دڵشادم و مەی نۆش و خەرابم
زاهید وەرە بنوارە، بولەند پایەیە فاڵم[7]
مەدهۆشی[8] وەفاکێشم[9] و (هێژا)یە مەقامم
ئازادەوو[10] فەرزانەی ئەوێ دەرکی کەماڵم

(١) قەدەح: جامی بلوور. (٢) قسەوباس و هەرا و بەزم. (کردی بە قاڵ): کردی بە هەرا. (٣) پوختە: پێگەیشتوو، قاڵ و لە کل دەرهاتوو سوورکراو. (٤) کاڵ: پێنەگەیشتوو و نارەس و کورە نەدیو. (٥) ئاوا: بانگ و ئاهەنگ. (٦) خورد و کەلان: گەورە و بچووک. (٧) فاڵ: ئیقباڵ، بەخت. (٨) مەدهۆش: سەرمەست. (٩) وەفاکیش: وەفائایین. (١٠) فکری ئازاد و لێ بزانی ئەو: ئازادە و فەرزانەی ئەوی.



## چینەکردن

مەلی ڕۆحم[1] لە خەویا دانە بچنێ
لەناو خەرمانی[2] ڕووتا شەو ئەبژنێ[3]
چ سەرکێشە گڕووی خاڵدانە ئەگرێ
لە دەوری لەعلی لێوتا گێری بێنێ
لەجووجە[4] و موشتەریی یاقووتی[5] ڕووتە
کە لەعلی[6] لێوت ئەبینێ، دائەمێنێ
بە دڵ کڕیاری میسکی[7] خاوی خامە
کلافەی مووت گرانتر لەو ئەسێنێ
مەلی ڕۆحم بە نەغمەی سازی چینە[8]
لەلای لێو دام و دانە دائەچێنێ
لەناو گوڵبەرگی ڕووتا مەی[9] ئەنۆشێ
مەیێ خۆشڕەنگ و داغ و خەم ڕەوێنێ
ئەڵێ مەستانە ئاهەنگی خەرابات
خەراباتی لە خەو، دائەچڵەکێنێ
ئەڵێ غافڵ! چلۆن چاوت لەیەک نا
مەگەر دێتۆ کە چوو،[10] ئەمڕۆ سبەینێ؟
لەنێوانی ئەوین و بەزمی ژینا
لە دڵدا حەیفە هەستێ[11] خۆ نوێنێ
ئەبێ (هێژا) لەوێ حاکم بێ بێجگە
خەراب ئەندەر[12] خەراب هیچ کەس نەمێنێ

(١) مەلی ڕۆحم: پەرندەی ڕۆحم. (٢) خەرمان: قورس، دائیرە. (٣) شەو ئەبژنێ: مووت کە ڕەشە وەک شەوە لەسەر ڕووت لائەبا. (٤) لەجووجە: سمجە. (٥) موشتەری و خواهانی ڕووی یا کوڵمی یاقووتی ڕەنگی تۆیە. (٦) لەعلی لێو: کە لێوی لەعل وێنەت ئەبینی سەری لێ ئەشێوێ. (٧) بەدڵ حەز ئەکا میسکی خام و خاو بکڕێ، بەڵام کلافەی موو وەک میسکی تۆ کە لەویش ڕەشترە (زلفت) بە

گرانتر ئەسێنێ. (٨) سازی چینە: بە ئاهەنگی چینەکردن. (٩) حەزی لێیە لە گولبەرگی ڕوومەتتا مەی بنۆشێ، عەرەقی سەرگونات بنۆشی. (١٠) چۆن ئەو حەلەت لەدەس داوە و نوستووی؟ مەگەر سبەینێ ئەمرۆ دیتەوە، واتە مەگەر فرسەتی ئەمرۆ سبەینێ بەدەست دێ؟ (١١) مەگەر لە دونیای عیشقا ئەبێ مەجال بدرێ شتێ تر خۆی بنوێنێ؟ (١٢) ئەبێ تەنیا عیشق خۆی بنوێنێ و حاکم بێ لەو مەیدانەدا، مەستی بە مەیی خۆشەویستی خۆی بنوێنێ و لاغەیر.



## های ڕەو

های کۆس[١]، های کۆتەڵ[٢]، های شین و زاری
های سۆزەی فوغان[٣]، های دەردی کاری
های ڕەو[٤]، های فیرار، های تۆفان، های تەم
های مەینەت، های خەم، هەیا هووی ماتەم
های جەور، های ستەم، های هەناسەی سەرد
های بێ ویجدانی، های یاغی و نامەرد
های کوشتار، های خوێن، های کۆت[٥]، های زنجیر
های بەندی، های دیل، های ناڵەی یەخسیر[٦]
های ڕۆمەڵخەزا[٧]، های شین، های ڕۆڕۆ
های وەی من وەی من، های بۆنی بۆسۆ[٨]
های قیژەی ساوا، های ناڵەی زەبوون
های پیری داماو، های قرچەی دەروون
های سۆزی سینەی وەڵەد گوم کەردە[٩]
های دیدەی گریان ساکاری[١٠] هەردە
های گیڤەی بۆران[١١] کوێستانانی سارد
های جەستەی عوریان خەستەی ناموراد
های برسی و تینووی نەخۆش و زەلیل
های زەدەی زاڵم، های ئازادەی[١٢] دیل
های دەربەدەران سەر شاخ و هەردان
های سەرما زەدەی ئێلاخ و عوریان
های ئێش، های زووخاو، های سکاڵای گەرم
های ئەڵهای[١٣] ئافرەت تەنیا لەلای تەرم
های ماڵ وێرانان، دەربەدەر وەیلان
های خان و خاتوون توونا[١٤] و سەرگەردان
های جەوان و گەنج دڵ کەیلی ئاوات
های کیژی نازدار، مەلوول، غەمین، مات

هـای زەڕنمـای دوون[١٥] بـێ دیـن و تـەور لـەق[١٦]
های هەرزەی موجریم، های قاسیی دڵ ڕەق
کام دین، کام ئایین، کام عورف، کام قانوون
کێ وای ڕەوا دی، کام پەس، کام مەلعوون؟
ناشێ پێی وابێ سەگی زیبانە خرۆ
ئەم تاوانانەی لەبیر ئەچێتۆ
ناشێ پێی وابێ و ئەبێ ئەتوانێ
گەلێ لەبەین باو بە خۆی نەزانێ
شکی تییا نییە عالەم ئەزانێ
ناتوانێ هەروا بە مەیل بیڕانێ[١٧]
ستەمگەر ئەبێ سزای بچێژێ
گۆڕێ کە کەندی خۆی تیا بنێژێ
چاوەڕێی تف و لەعنی مێژوو بێ
مەخسەرەی لات و پەست و بێژووبێ[١٨]
گەل هەر ئەمێنێ، نامرێ، نافەوتێ
قەومێ تییا ناچێ بە کەوت[١٩] و ڕەوتێ
ئەم واتەی (هێژا) لەپێش چاوی بێ
تا وەختێ وادەی سەگەڕاوی بێ

---

(١) مردنی ئەندامی بەکاری خانەوادە: کۆسکەوتن. (٢) کۆتەڵ: تەمسیلییە ئەوترێ کە لەکاتی مردنی گەورەکانا ڕێ ئەحرا (ئاڵایی و کۆتەڵ). (٣) فوغان: گریان و زاری. (٤) ڕەو: فیراری دەستەجەمعی. (٥) کۆت: دارێکی گەورە بوو کەپێی دیلیان ئەخستە بەینی و ئەیانبەست. (٦) یەخسیر: دیل، عەزابدراو و دوورخراوە. (٧) ڕۆمەڵ خەزا: بە هەرا و شیوەن و فیتنە ئەوترا. (٨) بۆسۆ: کنایەیە لە زامار چونکە پەڕۆی سووتاو بۆسۆیان ئەنا سەر زام. (٩) وەڵەدگوم کەردە: بەدایکێ ئەڵێن منداڵی ساوای لێ ون بووبێ. (١٠) ساکاری هەردە: سادەی وەیلان. (١١) بۆران: بارینی بەفر و باران بەباوە لە زستانی ساردا. (١٢) ئازادەی دیل: ئازاد مەنشی ئەسیرکراو. (١٣) ئەڵها: سکاڵای مەردە مۆدار یا غەمگین. (١٤) توونا: تەبعید، دوورخراوە. (١٥) زەڕنمای دوون: پەستی بە چاک خۆنوێن. (١٦) تەورلەق: بەدئەخلاق و هەرزە و بەدکار. (١٧) بێڕانێ: ڕاییوێرێ. (١٨) بێژو: حەرام زادە. (١٩) کەوت و ڕەوت: هەستان و کەوتن.



## مۆنەمۆن

داد و فەریاد و سکاڵا مەسلەکی بێ کارەیە
مۆنەمۆن[١] دانان لە عالەم کردەوەی پەتیارەیە
ڕاپەڕە وەک شێر بەرەنگاری مەشاکیل بەو برۆ
هەرکە تەن[٢] دەردا بەخواری عاقیبەت بێ چارەیە
پێ تەقاندن[٣] بێتە هۆی جێهێشتنی کۆز[٤] و کەلێن؟[٥]
هەر کە کۆڵی دا و بەزی هەر سەرکز و ئاوارەیە
تاقیکاری و تەجرەبە پێشان ئەدا هەروا بووە
سڵکەر[٦] و دوودڵ[٧] لە ژینا بێ وەری و بێ بارەیە
لاش[٨] و تەنبەڵ پیاوەتی لێ نایێ، بڕوای پێ مەکەن
خۆ بەزلزان و تەماعی و لۆردنما[٩] و بێ پارەیە
پاشملە دندانی خێر نانێ بەهیچ کەسدا، بەڵام
ڕووبەڕوو چاپلووس و دۆس و هاوەڵ و غەمخوارەیە
سەد کەرەت یاغی دەبی و دیسانەوە دێتۆ سەلام
پێت ئەڵێ بمبەخشە تۆبەم بێت و هەر ئەمجارەیە
هیچ لەڕووناچێ[١٠] تەریقی کەیتەوەو سەرچەنگی دەی[١١]
چونکە مەنگە[١٢] پێی وەهایە چارەی ئەو ڕەفتارەیە
لێی گەڕێ کوتای کە (هێژا) چیت ئەوێ لەو تاقمە
گوێ خنیو[١٣] کوا دەربەسەو کەی گوێی لە ئەو گوفتارەیە

---

(١) مۆنەمۆن: لەبەرخۆوە لەم و لەو دوین و گلەکردن. (٢) تەن دەردان: مل کەچ کردن و ڕازی بوون لە ویستەی زۆردار. (٣) پێ تەقاندن: هەڕەشە. (٤) کۆز: ماڵی گڵی و شوێنی ڕاگرتنی کاروبەرخ. (٥) کەلێن: دەرگای ماڵی دێ. (٦) سڵکەر: ترسنۆک و بێ زات. (٧) دوودڵ: موتەرەددید، ئەرێ ونەرێکەر. (٨) لاش: تەنبەڵ و قنگ قورس. (٩) لۆردنما: ئەوی کە لە خۆڕایی خۆی بە دارا لە قەڵەم ئەدا و واش نییە. (١٠) لە ڕوونەچوون: تەریق نەبوونەوە و بێ شەرمی. (١١) سەرچەنگ: سەرکۆرەکردن و کاڵکردنەوە و تەریقکردنەوە. (١٢) مەنگ: حەپۆل، خوڵ. (١٣) گوێ خنیو: نەژنەوا.

## مەردومەک

ئازادم و پرشۆرم و سەرخۆش و خەرابم
کەی دەربەسی نەشئەی قەدەح و جامی شەرابم
ئەوکاتە کە پەیکم لە دەسی ساقیی ئەوین سەند
ئەمزانی کە مەمنووعە ئیدی[1] رەنج و عەزابم
بێ باکم و ئارامە دڵم، تەختە[2] لە ئاشووب
بێ دەربەسی ئەفسانەیی ئازار و عیتابم
ئەو رۆژە لەناو مەردومەکی[3] چاوی خوماری
گلیام[4] و گلی دامەوە، مەعلووم بوو حیسابم
بەستەی خەمی ئەگریجە لە بوتخانەیی ئەودام
ناگونجێ هەراسان لە خەمی بەندێ ترا بم
پەیکێ کە بسێنرێ لە خوماری خومی مەخموور
هێند[5] داغە دەسووتێنێ هەڵەی[6] هەوڵی شەبابم
حەددی چییە گەرمای مەیی «مێو»[7] تینی وەهابێ
داغتر بێ لە جەزبەی جگەری داغ و کەبابم
ئەو تیشکە لە دیدەی سەنەمۆ دای لە دڵی من
گۆیا بوو کە موستەغنی[8] لە نەشئەی مەیی نابم
سەرخۆشی ئەوین کوانێ نیازی بە شەرابە
چەن خۆشە چلۆنم «أبد الدهر» وەها بم
سەرمەستی بەرینی[9] ئەبەدی بەزمی ئەوین کەی
شایستەیە (هێژا)! کە بڵێ: مەستی شەرابم

(١) ئیدی: ئیتر. (٢) دڵم تەختە: مطمئنم. (٣) مەردومەک: گلێنەی چاو. (٤) گلیام: هەڵدیریام و کەوتم. (٥) هێند: ئەوەند. (٦) هەڵە: غەڵەت. (٧) مەیی مێو: شەرابی ترێ. (٨) موستەغنی: بێ نیاز. (٩) بەرین: بەهەشت = وەسیع.



## پایەی ستەم

رەوە[1] و کوشتار و تالانە و رەش و رووت
پەرێشان گەنج و لاوە و خەڵکی فەرتووت[2]
مناڵ پێ خاوس و برسی و رەش و رووت
هەتیو گریان و پیر بێ کەوش و قاپووت[3]
هەموو هەڵدێن و ئاوارەن بەجارێ
لەتاوی گازی سەممی و بێنی بارووت
ژن و منداڵ هەبەسیاو[4] و پرووکاو
جەوان مأیووس و سەرسام، مات و مەبهووت
بەرەو دوا سەیر ئەکەن، زوو زوو ئەبینن
لەسەر سێنگێ، گوڵێ خوێناوی پشکووت
گولەی شەستیر لە پەیتا ئەسمێ بن دەس
جەوانێ هەڵدەتلیێ بێ خەتا و رووت
نەما داکێ کە داغ نەکرابێ، هاوار!
دڵی دڵسۆزێ کوا مابێ و نەڵێن سووت
وەها پایەی ستەم، پێی داکوتاوە[5]
خەراب ئەندەر، خەرابە[6] مولکی ناسووت[7]
لە رۆرۆی بێ نەوای کوردانە (هێژا)!
خرۆشاوە و ئەجۆشێ خەڵکی لاهووت[8]

(١) رەو: فیراری دەسەجەمعی و عمومی و تەرکی دیار و هەستی. (٢) فەرتووت: پەککەوتوو و پەرێشان. (٣) قاپووت: پاڵتاو. (٤) هەبەسیاو: رۆحیە و تەنی خەستە. (٥) پێ داکوتان: ثابت وەستان. (٦) خەراب ئەندەر خەراب: وێران لەسەر وێران. (٧) ناسووت: خەڵکی دونیا. (٨) مەلەکووت: عالەمی مەعنا و غەیبی کەون.

## لێ بڕان

لە دەس جەود و ستەم بۆ دابمێنم، مات و شیوەن کەم
لەمەولا شەرتە بەو چەرخە چەموشە[١] چەوتە ڕێشخەن[٢] کەم
بە گوڵگە شتی وەڵاتمدا بسووڕێمۆ بە کەیفی خۆم
چەم و دۆڵ و کەژ و کێو و چیای جوانی بە مەسکەن کەم
ئەوی چەپ سەیری[٣] هۆزم کا بە حوکمی خۆشەویستیی ئەو
بە ئایینی خیرەد[٤] لاڕێ[٥] زەلیل و دیل و پێوەن[٦] کەم
دەسا شەرتە ئیتر ترسی ئەم و ئەو ڕێ نەدەم، بێ باک
لە پۆڵای سەختی لێبڕیان زرێ[٧] و قەڵخان[٧] و جەوشەن[٨] کەم
لە پەرتی و چۆڵ نشینی دەرچم و مەردانە تێکۆشم
ئەوی دوژمن خراپی کردووە گشتی بە گوڵشەن کەم
ئەگەر خوا یار بێ پێویستە خەرابکار پەست و بەیدەس[١٠] بێ
ئەبێ بێ بەندو بار و نالەبار دووساخ[١١] و دەسبەن کەم
ئەگەر یارانی گیانی بێنە دەورم هاریکاری کەن
دەبێ دێوی خەرابکاری حەواڵەی گۆڕی بۆگەن کەم
وەڵاتی کوردەواری سەرلەنوێ ئابادکەمۆ دیسان
هەموو باغ و سەراو و جۆگەلەی وێرانی نۆکەن[١٢] کەم
هیوام وایە بەزۆری دانیشی گەنجانی لێ هاتووی
خەیانەتکار و بەدکاری دوچاری بەزم و گوبەن کەم
دە خۆزگەم بەو حەلەی[١٣] ئاواتی دێرین دێتەدێ ئەوسا
گوڵ و لالە و هەراڵە و سونبولی کێوان بە سەیوەن[١٤] کەم
کوڕ و کیژی وەلاتی کوردەواری بێنە سەیران جا
بلێت (هێژا): ڕەوایە ئێستە گەر شادی و زەماوەن کەم

---

(١) چەمووش: لاڕێ و شەڕانی. (٢) ڕێشخەن: مەخسەرە. (٣) چەپ سەیرکردن: واتە بە چاوی بەد ماشاکردن، موخالیف. (٤) بە ئایینی خیرەد: ڕەهنمای عەقڵ بە ئایینی تێگەیشتن. (٥) لاڕێ:



مونحەریف. (٦) پێوەن: بێ بەسراو. (٧) زرێ: کراسێکە لە زرێ دروس ئەکرێ بۆ بەرگری لە تیر و شیری دوژمن. (٨) قەڵخان: ئەوەتانێ کە مەردی جەنگی ئەیگرێ بەپێشیەوە (سپەر). (٩) جەوشەن: کڵاوێکی زرێیە بۆ بەرگری لە شیر و تیر. (١٠) بەیدەس: دەستەڵات لە دەس سەندن. (١١) دوو ساخ: ڕاست و چەپ بەستنەوە. (١٢) نۆکەن: بەجۆگەییێک ئەڵێن کە تازە هەڵکەنرابێ. (١٣) حەل: وەخت، ئان. (١٤) سەیوەن: سەیبان، سایەبان، کەپر، سابات. بەو چەشنەی کە ڕەسمی هەوارەکانی کوردستانە، سەرکەپر بە: چنوور، شەوبۆ، سوور هەراڵ، وە باقی گییا بۆن خۆشەکان دائەپۆشن، کە سێبەر بێ و بۆی خۆش بێ.

## شەیدا

لە ڕیسوا چیت ئەوێ، شەیدایە ڕیسوا[١]
تەشەر چی بکا لە شەیدا، شێتە شەیدا
نە دەربەس تیر و تانە و عەیب و عارە
نە بەو چەشنەی عەقڵ پێی باشە ئەڕوا
بە گیتی و کاروباری خەڵکی گیتی
گەلێ بەدبین و بێ ئیمان و بڕوا
لە پانای[٢] بێ پەڕی[٣] ویستی دەروونا
هەراسان هەڵدەسووڕێ بێ سەروپا
ئەوەی وا نابەڵەد بێ کوا ئەزانێ
لە بەینی داد و بێ دادا[٤] چ قەوما
خوماری حیرەتی سەرگەردی ئاوات[٥]
سەراپای شوور و واوەیلا[٦]و و غەوغا
لە خێڵخانەی خوما[٧] هەڵڵایە هەڵڵا
کەسێ چاک تێینەگا شەرتە حەزەر کا
دەمێ ماتی و سکووت و بوردەباری
سەرێ شۆری شەراب و جامی صەهبا
زەمانێ زەمزەمەی ئاهەنگی مەستی
دەمێ ئاوایی چەنگ و سۆزەیی نا
لەوێ دڵ جام و مەی مایەی حەقیقی
لە گەردشدایە مینای پڕ لە سەودا[٨]
وەفاکێشن[٩] بەجارێ جورعە نۆشان
سەراسیمە و خومار و ژیر و زانا
تەواو یەکسان و یەک ڕەنگ و خەرابن
مەی و ساقی و سوراحی و جام و مینا



لەوێ مەردی دەوێ ئاگای لە خۆ بێ
پەل[١٠] و سەرمەس جەوان و پیرو بۆڕنا[١١]
لەبەرقاپیی نییازا[١٢] شێت و شەیدان
ئەمیر و، خوسرەو و، خاقان و، کەسرا
فیدای یەکڕەنگیی ئەو خێڵەم بەڕاسی
بە بێ دەستار[١٣] و ڕیش و کەوڵ و عابا
دڵی (هێژا) لەلای ئەو هۆزە دیلە
مەڵێن بێچارەیە، شەیدایە شەیدا

---

(١) ڕیسوا: بەدناو و بێ بایی. (٢) پانا: مەیدانی بەربڵاو. (٣) بێ پەڕ: بێ ئینتیها. (٤) داد: عەدڵ. (٥) سەرگەردی ئاوات: فیداییی هەدەف و ئارمان. (٦) واوەیلا: هاوارو داد و فەریاد. (٧) خێڵخانەی خوم: جەمعی مەی نۆشان. (٨) سەودا: هەدەف، مەرام. (٩) وەفاکیش: وەفا ئایین. (١٠) پەل: پەککەوتوو. (١١) بۆڕنا: نەوجەوانی موونەڕەستوو. (١٢) نییاز: تەمەننا. (١٣) دەستار: سەرەپیچ، مێزەر، شەدە.

## جامی ڕووناک

له خومخانەی[١] خەراب ئابادی[٢] مەستی
له جەمخانەی[٣] جنوونی بوت پەرەستی
پەرێشانحاڵ و خامۆش پیاڵە نۆشان[٤]
دەسەونواڕی مەیی مینایی[٥] هەستی
کە بەشکەم ساقی مەی بێنێتە گەردش
بسێنێ هەر کەسێ جامێ له دەستی
خرۆشان «مووبەد»[٦] و «دەیری» و «کەنشتی»
هەموو حیرەت زەدەی ڕازی «ئەلەستی»[٧]
هیوادارن کە نەشئەی جامێ ڕووناک
نەجاتیان دا له ژەنگ و نەنگی کەستی[٨]
جەم و یەکڕەنگ و یەکدەنگ بن له ژینا
نه دەربەس بن، نه دیل و حەپس و بەستی[٩]
هەموو (هێژا) بن و ئازاد و سەرخۆش
له گوڵگەشتی جینان بێ کەست[١٠] و پەستی

---

(١) خومخانه: مەیخانه. (٢) خەراب ئاباد: پڕ له مەست و ئاوەدانی مەستان. (٣) جەمخانه: جێی کۆبوونەوە. (٤) پیاڵە نۆشان: ئەوانەی پیاڵە لەسەر پیاڵەیان نۆشاوە «خواردوەتەوە». (٥) جامی بلوور: مینا. (٦) مووبەد: موئبەد، پیاوی ئایینی زەردەشتی. (٧) ئەلەستی: توحید و الوهیت. (٨) کەستی: ناتەواوی. (٩) بەستی: پەناهەندە. (١٠) کەست: نابوود و ناتەواو.



## شەیدای ساز و ڕاز

له طووفانی هەوادا[١] مات و مەدهۆش
پەرێشانحاڵ و سەرگەردان و بێهۆش
له جەرگەی بەزمی شەیدای ساز و ڕازا[٢]
دەسازێن و دەسووزێن مەست و خامۆش
هەراسان، سۆفی، گریان ڕەند و عەییار
گرۆیێ گەرمی غەوغا و، جەمعێ سەرخۆش
سەبووی[٣] بەعزێ پڕی مەی، جامی خاڵیم
گەوای[٤] حیرمان له شۆڕو نەشئەیی[٥] نۆش
شەکیبایی[٦] ئەگەر یاری پەکەر بێ[٧]
هەڵێنێ تا لەسەرخۆ بێت و باهۆش
سەرئەنجام هەر ئەبێ مەینەت بەسەرچێ
لەسەر ڕازی نیهان هەڵگێرێ سەرپۆش
گەلێ ئارایشی[٨] شەیدایی ڕیسوام
موعەممایه لەکن دڵتەنگ و پڕجۆش[٩]
ئەدەن تانه له مەندی[١٠] و بوردە باریم
بڵێسەی کوا ئوجاخی[١١] سارد و خامۆش؟
درێغ! وا قەدر و بایی سازشی من
نەزانیا و ئەرزشی کریا فەرامۆش
ڕەفیقان! چێو له تاریکی،[١٢] کوتانن
خەتایه و بێ حیساب ناخۆشە ناخۆش
گەلێ خاوەن شکۆیه مەستی بێ مەی
چەنێ جوانه کە سەرخۆش بیت و خامۆش
ده توخوا دژ بە جوانی قەت مەوەستێ
مەدەن تانه له شەیدای شیک و تەڕپۆش

جیهانی خەڵقە وای هێنایەکایە[١٣]
دە کاشکی وا دەسوورِا[١٤] بۆ من و تۆش
کەسێ (هێژا) بێ جوانیی جوان ئەبینێ
ئەوی بەدبینە هەر ناخۆشە[١٥] ناخۆش

(١) هەوا: مەرام. (٢) سازوڕاز: سازیان و ڕازداری. (٣) سەبوو: شەربەی گڵێ. (٤) گەوا: شاهید. (٥) نەشئە: لەززەت. (٦)شەکیبا: سەبر، تەحەممول. (٧) پەکەر: مات و پەککەوتوو. (٨) ئارایش: تەرتیبدان، ئامادەکردن. (٩) پڕ جۆش: تووڕە. (١٠) مەند: لەسەرخۆ. (١١) ئوجاخ: کوانوو، ئاوردان. (١٢) چێو لە تاریکی کوتان، نابەلەد و بێ ئیطیلاع خۆ گەیاندنە مەتڵەب. (١٣) هێنانە مەیدانی بازی: هێنانە سەر شانۆ. (١٤) وا دەسوورِا: وا پێش ئەهات، وا ڕێ ئەکەوت. (١٥) ناخۆش: نەخۆش.



## شینی هەژار

دە توخوا دەس لە دەردی دڵ مەدەن، یاران! هەژارم ڕۆ
هەژاری مەردی مەیدان و قەڵەم گەوهەر نیگارم ڕۆ
بە شمشێری زمانی صەفدڕ و لەشکەرشکێن و مەرد
وتار پاراو و، هۆنراو سوار و، پڕ مەعنا و بەکارم ڕۆ
لە ڕەزمی دوژمنی کوردا بە دووفاقی قەڵەم سالار
لە مەیدانی ئەدەبدا چاکترین چاپوکسەوارم ڕۆ
خەباتکار و وەفادار و نەترس و هۆنەر و زانا
ئەدیب و نوکتەزان، ئوستادی مەند و باویقارم ڕۆ
سەراسەر عومری تاراو[١] و فیراری و دوور[٢] و سەرگەردان
غەریب و ڕەنجەڕۆ و تار[٣] و تەریک[٤] و بێ قەرارم ڕۆ
(عزیز النَّفس) و خۆش ئەخلاق و ئازادە[٥] و وەطەن پەروەر
لەسەر داکۆکی[٦] بۆ هۆزی لە ژینا تارومارم[٧] ڕۆ
خوداناس، نیشتمانپەروەر، زمان شیرین و خۆش زاراو[٨]
لە جەوری نابەکارانا[٩] دەرەندووی[١٠] سەردیارم[١١] ڕۆ
لە دڵسۆزیی گەلا سووتاوی پڕ تاوی ئوجاخی[١٢] هۆز
لە کوورەی مەینەتی کورد نیمەسۆزی سەرهەوارم[١٣] ڕۆ
لە شیوەنگای گەلی کوردا بە دڵ گریان و ڕۆڕۆیە
لەشین و کۆچ و ماتەمیا گەلێ بۆی داغدارم[١٤] ڕۆ
بڵێ، عاقڵ! بەهۆزی داغداری بێ قەرارت قەت
نەڵێی فەوتا (هەژار)، ڕۆیی، بڵێن زیندووی[١٥] وتارم ڕۆ
حەقە داکی وەطەن (هێژا) بەخوێن گریان و زاری کا
بەکوڵ شین کا و بڵێ: «داخی گرانم وەی هەژارم ڕۆ»[*]

(١) تاراو: تاریزیاو، تەعقیبکراو. (٢) دوور: تەبعید. (٣) تار: فیراری. (٤) تەریک: لەگەل بڕیاو و تەنها. (٥) ئازادە: جەسوور. (٦) داکۆکی: فیداکاری، دفاع. (٧) تارومار: دەربەدەر و ماندوو.

(٨) زاراو: لەهجە. (٩) نابەکاران: بەدکاران. (١٠) دەرەندوو: دوورکەوتەی وەڵاتان. (١١) سەردیار: مەملەکەتان. (١٢) ئوجاخ: کانوون، مەرکەز. (١٣) نیمەسۆزی سەرهەوار: چڵۆسکی نیوە سووتاو و کوژاوە نیشانەی حەرەکەت و نیشاطی هۆز و کوچ و جێبەجێ بوونە. (١٤) گەلێ بۆی داغدارم ڕۆ: میللەتێ بۆی داغدار، گرۆیێ زۆر، سەخت بۆی داغدارن. (١٥) مەڵێن هەژار تەواوبوو، هەژار بە وتاری هەر زیندووە. (*) مادە تاریخ بە حیسابی ئەبجەد: ١٤١١ی هـ. ق.



## بەقی پیرۆک

بەقی پیرۆکی[١] بەر کاوی[٢] هەوارم
ڕەفیقم پاکی چوون، من ماندگارم[٣]
ئەپرسن لێم ئەگەر بۆ وام بەسەر هات
لە بێ «چیڵیمە»[٤] غەمبار و نەزارم
ئەقلیێمۆ[٥] لە سایەی بەردی هەردا
ئەچیڕێنم لە دووی هەمڕاز و یارم
دەمێ «بانگ»[٧] و«بنە»[٨]و، تاوێ بە «ورتە»[٩]
خەریکی دڵنەواییی یاری غارم
بەڵام «چیڵ»ی جەوان و شۆخ و مەغروور
دەزانێ پیرەکێکی، کەوتە کارم[١٠]
ئەچێ بێ ئیعتینا بەدوای مورادا
منیش هەروا لە «گەردە»[١١] و «بەردبژارم»[١٢]
تەمادارم کە هاودەردێ وەکو خۆم
سەری دەرچێ لە دەردی نادیارم
لەگەڵما «بێتە ناو»[١٣] بێ ڕاز و ڕیوەن[١٤]
ببێتە یاری گیانی و غەم گوسارم[١٥]
نکە و ناڵەم قەبووڵ کا، بمحەوێنێ[١٦]
وەکو من چارە جۆی «چیڵی» هەژارم
بەڵام کوانێ ئەوی هاودەردە پێ بێ[١٧]:
منیش تەنگاوی ژین و ڕۆژگارم
عیلاجی دەردە (هێژا) پێ لە حەق نان[١٨]
لەکوێم بوو کەوکەبەی[١٩] پێرار و پارم

---

(١) بەقی پیرۆک: نێرەکەوی پیر، بەق: نێرەکەو. (٢) بەرکاو: بەر مەغار. (٣) ماندگارم: ماومەتەوە. (٤) چیڵ: ماکەو. (٥) قلیانەوە: کەوی نێر کە بێ حەوسەلە بخوێنێ ئەڵێن (ئەقلیێتەوە).

(٧) بانگ: خوێندنی بەرز و درێژی کەو (کەوە کە بانگی چاکی خوێند). (٨) بنە: خوێندنێکی نەرمی کەوە، کە کەوی تر بانگ ئەکا بێن بۆ لای. (٩) ورتە: قرتەقرتی ئارامی کەو بەتایبەت کاتێ باز لە دەوریا بێ. (١٠) کەوتەکار: لێکەوتوو. (١١) گەردە: خۆڵەپۆت، کاتێ کەو خاکەسوورە ئەپڕژێنێ بەخۆیا. (١٢) بەردبژار: بەرد و زیخ هەڵچنینی کەو. (١٣) لەگەڵما هاتە ناو: لەگەڵما هاودەریی کرد، هاوکاریی کرد. (١٤) بێ ڕاز و ڕێوەن: بێ قسەوباس. (١٥) غەمگوسار: غەمڕەوێن. (١٦) بمحەوێنێ: پەزێراییم لێ بکا. حەواندن: بەزیرایی لێ کردن، بەدەور و پشتا هاتن. (١٧) پێ بێ: ئیقرار و ئیعتیراف. (١٨) پێ لە حەق نان: ڕاست و دروست دان پیانان. (١٩) تەشریفات و دەعیە و دەماغ.



## زیندانی تەمەننا

ئەسیر و دیلی ئاواتم، لە زیندانی تەمەننادا[١]
مەلوول و چاوەڕێم بەشکەم زەمان پێچی کلیل بادا
نەویدێکی فەرەح ئەنگێز لە بورجی ڕۆژگارۆ بێ
بڕێ خەرمانی غەم شەن کا[٢] و هەنێ کای کۆنە بەر با دا[٣]
شەوێ وەک ئەم هەموو خەڵکە سەرێ دانێمە سەر سەنگا
خەوێکم لێ کەوێ، ئاوات بەدی کەم بەش لە ڕوئیادا[٤]
ئەترسم مەرگی ناهەموار لە پڕ بێت و یەخەم بگرێ
لەپێش دیداری ڕۆح ئەفزای[٥]، بوتی دڵخواز و ڕەعنادا[٦]
هەموو داخێ لەگەڵ خۆم بەرمە ئەو دونیا و ملۆزم بێ
غەمی ئێرەم نەهێڵێ تا لەوێش جۆر بم لەگەڵ شادا
فریشتان بێنە دەورم کاتێ سەیری کەوکەبەی غەم کەن
دەرم کەن، ڕێم نەدەن، تاوێ، لە جەرگەی گەرمی سەودادا
کە من هەروا ئەسیر و غەم و زەدە، دووچاری مەینەت بم
لە کوێ فەرقی هەیە، ئێرە و ئەوێ، کەی وام لە دونیادا
کە ژین جۆش و خرۆشی تیا نەبێ ئەو ژینە کەی ژینە
چلۆن خامۆش و ماتەم بێ، هەزار دەستان[٧] لە مەزرادا؟
ئەڵێن مانگی «گوڵان»[٨] و «خاکەلێوە»و فەصلی «جۆزەردان»
مورادی حاصڵە بولبول لەعەیش و نۆش و غەوغادا
کەچی فەصلی بەهاری من نەپشکووت غونچەیێ تاکو
نەفەس کێشانێ[٩] ڕاحەت بم لەگەڵ مەستانی[١٠] شەیدادا
ئەڵێن (هێژا) گرانە دەردی، چاری چی بێ، خزمینە؟!
عیلاجم دادە[١١] تا دەرچم، لە چوار دیواری بێ دادا[١٢]

---

(١) تەمەننا: ئارەزوو. (٢) خەرمانی غەم شەن کا: وەکو فە لا بە شەن خەرمانەکەی تێکئەدا، مەجمووعە غەمی من بدا بەیەکا و شەنی تێ وەردا. (٣) کای کۆنە بەر با دا: بڕێ دەرد و موصیبەتی

کۆنەش بدا بە با. (٤) بە چاونابیینم بەڵام بەڵکو لە خەوا چاوم بە ئاواتەخوازم بکەویَ. (٥) ڕۆح ئەفزا: ڕۆح بژوێن، تەقویەتی ڕۆح. (٦) ڕەعنا: دڵڕفێن، دڵفریب. (٧) هەزار دەستان: بولبول، عندلیب. (٨) گوڵان: مانگی یەکەمی بەهار، خاکە لێوە، ئاخیر مانگی زستان، جۆزەردان، ئاخر مانگی بەهار. (٩) نەفەس کێشانیَ: هەناسەییَ. (١٠) مەستانی شەیدا: مەستانی عیشق. (١١) داد:عەدالەت، دادگەری. (١٢) بیَ داد: بیَ عەدالەتی.



## زامار مەڕەنجێنە

ئای لە شۆری شەوق شەوبێداری بەزم
مەدهۆش[١] و سەمەی[٢]، بیَ ڕاوێژ و نەزم
گۆزییای[٣] گەوزیای[٤] شەستی[٥] تیری مەس
ڕا لە دەس[٦] سنیای، دەسی باڵادەس
شپرزەی شێواز[٧] نازک نەوهاڵان
بەزیای کەمانکێش، خۆشتاڵەی[٨] دەوران
تەزیا وە قەمچیی سەرپەلکەی مووی ڕەش
وە بۆ کەوتەی[٩] زڵف میسک ئاسای ماوەش
ئای گیانفیدای ناز نازک نەوهاڵان!
ئای تەسلیم وە مەیل، بۆ قوربان هەرزان!
دەخیل نەڕەنجیَ، حەیفە فیدایی
خەمیر[١٠] مایەی ذەوق عیشق ئازمایی[١١]
نەشکیَ بلووری ئەروای نازەنین
گیان لە بان دەستان دڵباختەی ئەوین
نازنەوییَ تۆ بەت لەلای ئەهلی دڵ
عوذر و بەهانەت، پووچە و بیَ حاصڵ
ئامان وە تەعظیم ناڵەی خەستەی ڕاز[١٢]
بژنەون بە لوطف گرێی دڵ کەن واز
گیان کەن وە ماوای سۆزەی دەروونیان
لە ساز و سۆزیای مەبن هەراسان
ڕێی پەشیمانی کپ کەنۆ زینهار[١٣]
تیراوێیە زام زاری دڵ بیمار
(هێژا)ی زام زەدەی مەلوولی ناکام
پیێی وایە نەکریَ چارەی زام وە زام

(١) مەدهۆش: خومار. (٢) سەمە: گێژ و وڕ. (٣) گۆزیا: لی دریاو. (٤) گەوزیا: خولّە پیاوە. (٥) شەست: شەقەی تیر. (٦) ڕا لە دەس سنیا: (مسلوب الارادە)، بێ ئیختییار. (٧) شێواز: هەیئەت: شێوە. (٨) تالّە: ئیقبال. (٩) وە بۆ کەوتە: مندالّی بچووک و نازک بێنی خۆش بچێ بەسەریا نەخۆش ئەکەوێ. بەو بیمارییە ئەلّێن: بەبۆکەوتن. (١٠) خەمیرمایە: هەوێن، مایە. (١١) عیشق ئازمانی: تاقیکردنەوەی ئەوین و ڕادەی دەستەلاّتی. (١٢) خەستەی ڕاز: خەستەی سێر. (١٣) زینهار: ئامان، تەوبە.



## پەیامی ئاشنا

نەسیمی سوبحی ئاواتم کە شنیا، بەربەیان، یاران
پەیامی ئاشنای پێ بوو شنەی بەر کاوی کوردستان
بەلّێ پەیکی موراد موژدەی ویصالی دلبەری پێ بوو
کە پێچابووی لەبۆی «مەرزە» و «چنوور» و «نەرگس» و «ڕێحان»
چ شۆڕ و شادییێ ڕوی دا لە جەرگەی بەستەیی عیشقا
سەماو ڕەقص و هەرای هەستان لە مەستی بێ سەر و سامان
نە تەنیا دلبراوانی خرۆشان بۆ سەماکردن
شنەی موژدەی مورادی دا، نەشەی گیانبەخشی دابشکان[١]
دە توخوا تۆ بلّێ چۆن حەشرێ[٢] هەلّدەستێ لەکاتێکا
بدەن موژدە کە ئاواتی بەدی دێ قەومێ سەرگەردان
چ شیکە لاوی «سۆرانی» و جەوانی شادی «گۆرانی»
چ قنجە گەنجی «کرمانج» و یەلّی[٣] سەربەستی «بادینان»
چ ڕێکوپێک و پێکەوتوون جەوانمەردانی «لۆڕڕستان»
چ چالاکن کوڕی «بەرزان» و گەنجی کێوی «هەورامان»
هەموو پێکۆ کە بێنە بەزم و شادی و کامەرانیی گەل
نەوای سەربەستی ئەژنەوێ[٤] لە بەر کاوان و سەرهەردان
دەهۆلّ نرکەی بێ، هەستێنێ «خومار»ی سەر هەوارانی
بپشکێ[٥] «نەرگسی شەهلای» خەوالّووی مەستی کیژی جوان[٧]
نەوای هەی سوارە، هەی سوارە[٦] لە تەپلّی خێلّەکان هەستێ
دەسەی لاوان لە خومخانەی مەبەستۆ داخوڕن[٧] یەکسان
وەها ئاهەنگێ[٨] پێکبێنن لە خۆشیی مەحشەری بەزما
بە گەل سەر دەربهێنن ناموورادانم، لە گۆڕستان
مەگەر جەژنێ وەها[١٠] بگرن هەتاکو سەر لە نۆ (هێژا)
بە مەستی ڕاچەنێ و بڕواتە جەرگەی کۆڕێ سەربەستان

(١) دابشکان: دابەش کرد. (٢) چۆن حەشریێ: حەشرێکی چۆن. (٣) یەل: قارەمان. (٤) ئەژنەوییێ: ئەبیستریێ. (٥) بپشکیێ: بپشکویێ، دەم بکاتەوە، کینایەیە لە چاو هەڵهێنان. (٦) هەی سوارە، هەی سوارە: بانگەواز بۆ سواری وڵاخ بوونی سواران. (٧) داخوڕن: تێخوڕن و ڕاست ببنەوە. (٨) وەها ئاهەنگیێ: ئاهەنگێکروا. (٩) بە گەل: بە کۆمەڵ. (١٠) جەژنیێ وەها: جەژنێکی وا.



## پەند

پەیامی پیێ بەجێیم[١] کیێ ڕایگەییێنیێ
نەترسیێ و ناحەزی[٢] پیێ ڕاچڵەکێنیێ
لە هەرزە و بێحەیا هیچ سەرنەکاتۆ[٣]
لە کەرسواری مەکرباز دابەزێنیێ؟
زەریف حاڵیی بکا ناپاک سەرئەنجام
شەلاخی ڕۆژگار چاک ئەیچزێنیێ
ئەوی چەپڵەتەقێن[٤] و کاسەلێسە[٥]
دەڵەی[٦] دەوری کەسێکە بێچەرێنیێ[٧]
لەگەڵ ڕۆژی[٨] نەبوو بیدرێتیێ خێرا
لەفکرایە چلۆن خۆی ڕاوەشێنیێ
وەها لووت هەڵتەکێنیێ کەس نەزانیێ
لەگەڵیا هاودەم و یاوەر بوو دوێنیێ
گەلیێ ساکار و گەنجی کوردەواری
لە تۆڕداوی دەغەلدا دادەمێنیێ
بە هەڵنان و بە چاپلووسی و قسەی پووچ
جەوانی سینە ساف هەڵئەخڵەتێنیێ
شەو و ڕۆژ مۆڵەتی نادا، لەسەریەک
لە دڵیا تۆوی تەبذیر[٩] دادەچنیێ
هەتا پێی شک[١٠] ببا گیانبازە، دۆسە
تەقەی بن مەنجەڵی[١١] بیست، نایدوێنیێ
خەباتکاریێ بەرازەندە[١٢]م ئەویێ تا
پەیام و پەندی ڕاستم ڕاگەیێنیێ
وەها ئەو دەستە ڕیسوا کە کە ئیتر
مەجالی گەندەکاریی[١٣] بۆ نەمێنیێ

له خـەڵکی واز بهـێنێ و دابسـاکێ[١٤]
لەســـادە باجی دڵپـــاکی نەســـێنێ
لەســـەر زانا و ئەدیب و خـــوێندەواره
کە نووسـتوو ڕاچڵەکێنی و تێیگەیێنێ
ئەوی (هێـــژا) بوو دڵســـۆره بە هزری
تەپوتۆزی[١٥] تەمـــاعی نایبـــەزێنێ

(١) پێ بەجێ: دروست و ڕێکوپێک. (٢) ناحـەز: ناهەمـوار. (٣) سـەرکـردنەوە: سڵ کـردن و خۆپاراستن. (٤) چەپڵەتەقێن: ئەوانە کە دەوری سادە ئەگرن هەر ئافەرینی لێ ئەکەن. (٥) کاسەلێس: سک لەوەڕین. (٦) دەڵە: خوێڕی. (٧) چەراندن: لەوەڕاندن. (٨) ڕۆزی: ڕزق. (٩) تەبذیر: دەسبادی و هەڵەخەرجی. (١٠) پێ شک بردن: بە دەوڵەمـەند زانین. (١١) تەقـەی بن مـەنجـەڵی هات: واتە دارایيی تەواو بوو. (١٢) بەرازەندە: لێ هاتوو. (١٣) گـەنەکـاری: چەپەڵکاری. (١٤) داسـاکـیـان: دامرکان. (١٥) تەپوتۆز: هەڕەشەکردن.



## لانه بە لانه

کـــاتێ مـــەلی ئاوات بفـــڕێ لانه بە لانه
جێ ژوانی[١] لەوەوبەر ئەگـــەڕێ دانه بە دانه
بن دار و گـــوڵ و بنچکی[٢] جـــارانی ئەبینێ
هێـلانەیی شـاخـان و چیـای، شـانه[٣] بە شـانه
ناو باغی یو بن داری ئەپشکێنێ بەدیقـــەت
جـۆیایی مـەکـۆ[٤] و لانی قـەدیم، خـانه بە خـانه
بۆ لانەیی عیشقی ئەگەڕێ و شەوگەیی[٥] جاران
هەر بەرکـەنێ بۆی لێ بێ ئەچێ کـانه بە کـانه[٦]
هەرچاوگـەیێ هەڵئـەکـۆڵێ ئەچێ تاقی ئەکـاتۆ
خـێـوەت هەڵئـەداو تیـا ئەبەزێ هانه بە هانه[٧]
سـەرگـەشـتـە کـە دڵداری بوێ بەزمی لە کـوێ بێ
هاوڕازە لەگـــەڵ ســـاز و نەوای یانه بە یانه
چی بکەم لە دڵ ئازار ئەیەوێ تیـــرێ بهـــاوێ
پێی بسمێ دڵی هەردە[٩] بە بێ نێشی نیشانه[١٠]
پێی وایە کـە هەر عـاشـقێ وا دەردێ نەچێـژێ
با مـابێ لە جـەرگـەی هونەرا، مـانێ نەمـانه
(هێـژا)یە ئەوی دەفـڕێ لەدووی سـایەیی دلبـەر
سـەرتاسـەری مـەڵبـەندی ئەوین بانه بە بانه[١١]

(١) جێ ژوان: میعادگاه. (٢) بنچک: بووتە، شجیرە. (٣) شانە بە شانە: یاڵ بە یاڵ. (٤) مەکۆ: حەشار، جێی کۆبوونەوەی بە دزی و مەحرەمانە. (٥) شەوگە: جێگای مانەوەی شەو. (٦) کانە: جێی بەردی کنراو، درگـەی بن بەرد. (٧) هانە بە هانە: کـانی بە کـانی. (٩) هەردە: عـاصی و دانەکـێـو و بیابان و هەرد. (١٠) نێش: نووکی شتی تیژ لە چزەی حەشەرەوە تا نووکی تیر و نێزە. (١١) بانە بە بانە: مەیدانێکە کە جووتیار بۆ کێڵانی عەرزی ئەنێتەوە.

## شەقەی شەللاخی زاڵم

شەقەی شەللاخی زاڵم دێ، زەلی[١] کام چەم بەسەرما کەم
تەقەی تێلای ستەمگەر دێ، بەرەو کام مەملەکەت ڕاکەم
خەیاڵ و ئارەزووی بێ جێ، هەڵەی هەڵناوە بێپەردە
تەرەس شاتاڵی هێناوە، بەکام دەسمایە سەودا کەم
نە پووڵ و پارەو و زێڕ و نە چەکدارم هەیە تاکوو
خەیاڵاتی بەتاڵ و کەم، دەترسێم، نابێ حاشا کەم
بەتەنیا ئارەزووی ئاور، لە زوقمی ساردی زستانا
لەکوێ گەرمم ئەکاتۆ، کوورەیێکی داغ لە چی چا کەم
ستەمگەر حەقیە بێ باک و جەسوور وا بێت و دابخورێ
ئەزانێ یەکمە چاری ئەم سزا[٢] و بەزم و هەرا ناکەم
ئەگەر ڕاستان ئەوێ یاغی کە سڵ[٣] ناکا خەتای خۆمە
بەرەنگاری نەوەستام قەت، لەسەر حەق نەیدی هەڵڵا کەم
ئەویش زاڵ بوو، بەمەیلی خۆی دەسی کێشا بەسەرما وا
خرووکی لێ دی ئێستاکە، دەڵێم پێی نۆکەری ناکەم
بە ئاسان نایەوێ واز بێنێ، پێویستم بە هەستانە
ڕەوایە ڕاپەڕم پرسێ بەکارامە[٤] و تەوانا کەم
ئەبێ پسپۆڕ و ڕاوێژکاری وریا ڕانمایيم کەن
چلۆن سێنگم سپەر کەم، بانگ لە لاو و پیرو بۆرنا[٥] کەم
ئەگینا بێ بوار نابێ لە ئاو بدرێ وەکوو جاران
کە خنکام جا لەپاشان بۆ نەجات هاوار و غەوغا کەم
براکەم بەر لەوەی مەینەت، بەسەرما باڵی ڕاکێشێ
ئەبێ پیری خیرەد دەعوەت کەم و ئاوەز بە کوێخا کەم
بە تەنیا داد و قاڵی بێ چەکی لاو، گەنجی خوێن شیرین
چلۆن چاری جەفای ئێستاکەم و ڕەنجی لەوەولا کەم



ئەوەش ڕووناکە تا خۆم، قوڕ نەپێوم بۆ نەجاتی گەل
مەحاڵە خاکی بێگانە و قوڕی خەڵکی بەسەردا کەم
لەکوێ کاسە لە ئاش گەرمای فراوانتر[٦] دەبێ هەرگیز
چ پێشینیان مەتەڵیان دەرسە ئەر نەختێ تەماشاکەم
ئەوەندەم چەشتووە دەردی سەری خۆشباوەڕی (هێژا)
مەحاڵە سەهل و ئاسان دی[٧] بە هەر هەڵلایێ بڕوا کەم

(١) زەل: قوڕی خەستی زەلکاو (زەلی زرێوار). (٢) سزا: عەزاب. (٣) سڵ: کۆوەکردن و داچڵەکان (ئەسپەکە سڵی کرد). (٤) کارامە: متخصص، لە ئاو دەرهاتوو. (٥) بۆرنا: گەنج (بەرلە ڕیش دەرهاتن) ک: کرماشان، بیجاڕ، فارس. (٦) مەتەڵێکی کوردستانی ئێرانە: ئەڵێن بە تۆ چی مەگەر تۆ کاسەی لە ئاش گەرمتری؟ (٧) دی: ئیتر، کرماشانی و دینەوەری.

ناڵە ناڵی دڵ لە خەودا، شەو کە دەنگی دایەوە
زەنگی بێدارباشی[1] ڕۆحم بوو لەپڕ زرنگایەوە
مێشکی بیمار و هەژارم کەوتە خۆی بۆ تاووتوو[2]
من منی خۆی پێ نەگیرا، زوو دژی هەستایەوە
بەینی خۆم و ئاوەز و هەستی دەروونی داغی خۆم
هێندە تیر و تانە هات و چوو، دڵم بوورایەوە
نەفسی ئەمارەم دەمێ بوو، چووبووە پێستی خۆیەوە[3]
ڕاپەڕی و هەستا لەسەر نۆ کەوتە خۆی، بووژایەوە
عەقڵ و هۆشم لێ بڕا، فامم بەزی، هەڵهات و چوو
تاقەت و سەبرم نەما، ئاوەز لەلام گوێزایەوە
تاووتووی کرداری خۆمم کرد بەهەرجۆرێ نەبوو
تاوی تاوانم بەزی، ئاوەز سەرەوت و مایەوە
پیری زانستیم لە قینی فیز و دەعیەی جەهلەدا
تووشی سەرسام هات، لە داخی تانەدا بوورایەوە
ڕاستەکەی ئەم گورز و قاوانە هیلاکی کردووم
هەستی نادیاریم ئەوەن ئاشی شپرزەی[4] نایەوە
زۆر حەزم لێ بوو دەمێ بێ دەردیسەر بۆ خۆم بژیم
دوور لە گورز و قاو بەڵام ئەو بەزمە هەر نەبڕایەوە
هەستی ئینسانی شتێکی لێم دەوێ زۆر نادیرە
هەستی نەفسانیم لەسەنگەردا دژی ئەو مایەوە
جا ئیتر (هێژا)، لەدەس ضد و نەقیضی ناو دەروون
خەستەبوو، مانیا، لەداخا کەوت و پاڵی دایەوە

(١) بێدارباش: زەنگێکە سبەینێ زوو بۆ سپاهی لێ ئەدرێ لەخەو هەستێ. (٢) تاووتوو: کەم و زیادکردن بۆ ڕێکوپێککردنی کارێ. (٣) چووبووە پێستی خۆیەوە: ماتی دابوو لە خۆی و خۆی تێ نەئەگەیاند. (٤) ئاشی شپرزە: مەشرووعی بێ سەروبن.



## شیرین و فەرهاد

«وەرگێڕراوی قەصیدەییێکی سەعدیی شیرازی»

فەرهاد کە دیمەنی شیرینی دی بە چاوی خۆی
دووی کەوتە سەری، کەللە هەبەسیا لە تاوی خۆی
مەجنوون، بە جامی دیمەنی لەیلا کە مەستی کرد
بڕیا لە باب و دایکی یو هەستی و دراوی خۆی
ڕامین کە کەوتەداوی هەوای عیشقی وەیسەوە
زوو چاوی پۆشی لە زەڕکەمەر و کڵاوی خۆی
«وامیق» کە حەسرەتی «عەزرا» گەیانیە گیانەڵاو
ئەنجامی کاری شەو و ڕۆژی، ژان و تاوی خۆی
ئاوا، هەزارێ گەنجی مەست و پیر و لاوی کرد
وەک من، بەجامی شەهدی ئەوین، دەسبڕاوی خۆی
زۆرن ئەوانە بوونە ئەسیری کەمەندی عیشق
ئەو شۆرە نە تەنیا منی وا خستە داوی خۆی
ڕۆژێ کە چاوی من ئەو دلبەرەی خوماری دی
دونیاو و ئاخیرەتی خستە پشتی چاوی خۆی
لێم مەگرن ئەگەر عیشقی پەرێشانی کردووم
تەقدیرە، زۆری لەم قەبیلە هەن بەزاوی خۆی
(سەعدی) لە خەڵکی حاڵت هەتاکەی نیهان ئەکەی
(هێژا)یە ئاشکرایی ئەوین، دیارە تاوی خۆی

## گۆڕستانی ئاوات

ئاواتم یەک یەک شۆڕین بە خوێناوی ئەسرینم
کفنم کردن و نامە گۆڕ، لە زیارەتانی ژینم
حەسرەتم کردە بەریان، خەلاتی[١] تەرمی هیوا
لە غەم دروا سەراپای، لە کارگەی گەرمەشینم
بە ئاهم بخوورم دان، کاتی ئەسپەردەکردن
لاچاکم پڕ لە یاس کرد، کفنی شڕی جاوینم
کام کۆس و کام کۆلاراو[٢] لەبیر بەمۆ؟ پێم بڵێن
«هەڵەبجە» یا «شارەزوور» یا هەوارە هاوینم
«تەوێڵێ»و «بیارە»و «وەزەن» ، «ئاوێسەر»و «سۆسەکان»
یا «نارین قەڵا»[٣] و «خورماڵ» ، «باغەکۆن» دڵنشینم
دیوانێکی تایبەتیم پێویستە ناویان هەڵدەم
دەس لەدەردی دڵ مەدەن، یەکجار گەرمە کۆلینم[٤]
ئەر وێرانەی وەڵاتم هەڵدەم و بلاوێنمۆ
هیی هەرکامیان دیوانێ پڕ ئەکاتۆ نووسینم
چوار هەزار ئاوەدانیم، گۆڕستانە، ماڵوێران!
کێلی سەری هەر گۆڕێ، مێژوویێ لەپێشینم
قوڕ بۆ کامیان بپێوم، زەل بۆ کوێ بەسەردا کەم
بۆ کام دێی بەهەشت ئاسا و کام شارە دێی شیرینم
خەڵکە بۆ هەر شار و دێی وێرانەی کوردستانم
ئەبێ کێلێ هەڵکەنن بە تێزاوی ئەسرینم
تا نەوە و نەوادەی من، بزانن چی قەوماوە
هەروا بەسەریا نەچن، ڕۆڵەی دڵ ئاورینم
چ تابلۆیێ ئەتوانێ پیشانگەی ڕەوی کورد بێ
بۆ «مانی»یش موستەحیلە، تەجەسسومی بەرینم



لە هەر گۆڕستانێکا شەهیدێ ئەسپەردە بێ[٥]
ئەچنە زیارەتی گۆڕی خوشک و برای غەمینم
ڕۆڵەم، خوشک و براکەم! سەراسەر کوردستانت
گشتی گۆڕی شەهیدی زامار و دڵ برینم
بچنە سەر زیارەتانیان، بێ تاوان و شەهیدن
شەهیدستانە سەرپاک کوردستانی خوێنینم
تەماداری کەس مەبن بۆ ئێمە قوڕ بپێوێ
خۆم قوڕی خۆم نەپێوم، کێ بێتە سەر بالینم
ڕۆڵە، هەستن، ڕاپەڕن! بەس دەسخەڕەی درۆ بن
ڕووناکیی لێ بڕاوە، چرای هیوای بێتینم
یەک بگرن، فریاکەون! نەقشەی قڕان کێشیاوە
هارەی[٦] ئاسیاویی دوژمن، بیرازە[٧] بۆ هاڕینم
(هێژا) دەسەودامانە، ڕۆڵەکەم بەقوربانە
تەکان دە بۆ گەیشتن، بە ئاواتی دێرینم[٨]

(١) خەلاتی: کفنی مردوو. (٢) کۆس و کۆلاراو: ئالایی و کۆتەڵ و چەمەری شوێنی تەرم. (٣) نارین قەڵا: ناوی دێیەکە کە ئێستا بووەتە «نارنجەڵە» بەڵام پێم وایە (نارین قەڵا) بووبێ، یانێ قەڵای ئاورین، چونکە نزیکی «ئاتەشگا»یە کە «میزگیت»ی زەڕتووشتییان بووە. (٤) کۆلین: دەروون، هەورامی ئەڵێن (کۆلینیش پەڕەنە): واتە دڵی پڕە. (٥) ئەسپەردە: دەفن کردن، نانەگۆڕ. (٦) هارە: بەردئاش. (٧) بیراز: تێژکراوە، بەردئاش تێژئەکەنۆ، ئەڵێن هارەکە بیرازکراوەتەوە. (٨) دێرین: قەدیمی.

## قەرەداغ

داغی «قەرەداغ» داغە، چلۆن هێدی[١] دەبێتۆ
جۆشی دڵە، یاساغە، لەکوڵ نابێ بچێتۆ
نەنگێکە بەپێشانیی[٢] ستەمکارەوە، فەرزە
تا ڕۆژی قیامەت، لەپەسا[٣]، تازە کرێتۆ
پێم وا نییە ئەو کارە، وەکو مەتڵەبێ عادی
ڕووداوەیێ بێ، ڕەنگ بێ، کە دووبارە ببێتۆ
ئەو جورمە نەظیری نییە، نایابە[٤] لە کەونا
کەی دایکی زینا ڕووی هەیە وا زۆڵێ بزێتۆ
پێی ئەتکە ئیتر داکی زەمان ئاوسی نەنگ بێ
خواخوایە بەشەر زوو سەری ئەو عارە بنێتۆ
کەی شەرم و حەیایان بووە ئەو جەمعە چەتوونە
کوا یاغیی ستەم پیشە شەڕی لێ دەبڕێتۆ
توخوا وەرە ئینصاف بدە هیی وا شەرەفی کوا
عارێکی لەبیرنەچوە تۆ، ئەتکیتر ئەنێتۆ[٥]
ئەو نەنگە، کە زانکۆی[٦]، ئەدەب و دین و شەرافەت
وەک خاڵی خەتای مەسلەکی قەڵبی ئەسڕێتۆ
ئەو دەستە دژی دانیش و دینە لە ئەساسا
بێ شەرمە هەتا بۆی بچەلێ[٧] گۆبەن ئەنێتۆ
ڕووی هەرچی خەتابار و ستەمکارە سپیی کرد
چەنگیین و هەلاکۆ و تەتەری ڕووی ئەکرێتۆ
کەی پیر و ژن و مێردی لەگەڵ بێچوو بەجارێ
تێ ماشی، وەها بردی کە ون بێت و نەیێتۆ؟
پەنجۆلە و قاچ و قولی ساوا و قژی ئافرەت
لەت لەت بێ، فڕێ بدرێ، لە بیر چۆن دەبڕێتۆ



کەی ئەو هەموو گەنج و کوڕی قۆز و کچە کاڵە
دیل بوون و فرۆشران و کوژان بیرم ئەچێتۆ!؟
کام کۆڕی[٨] چراغانییی ئایینی (موحەممەد) «ص»؟
تەفسیری کەلامی ئەبەدی[٩] و شەرعی بڵێتۆ
ئاوازەیی[١٠] دڵگیری خوداجۆییی و عیرفان
لای کافری بەدمەسلەک ئەبوو زوو ببڕێتۆ
شاری «قەرەداغ»، جاڕی[١١] «ئەدەب» مەکتەبی «تەقوا»
ناوەندی «کەلام»، «فەلسەفە» خیز بۆ بگەشێتو؟
ڕووی ڕەش بێ لە دیوانی خودا و «ئەحمەدی موختار»[١٢]
هەر کەس حەزئەکا نووری حەقیقەت بکوژێتۆ
ئەو خووگ و بەرازە ئەبێ هەر زیانە خڕۆ بێ
بەدزاتی، حەقە، مەلعەنەتی، لێ بووەشێتۆ
(هێژا) بەتەمای نەحس و تەرەس بێتەوە سەر ڕێ؟
پێشینەیی نەنگینی لەبیر خەڵکی بەرێتۆ؟
زۆر سەختە گەلی ئێمە لە ئەو خێڵە ببوورێ
پێویستە، سزا بدرێ دەغەڵ، گوم بێ، نەیێتۆ

(١) هێدی: ئەهوەن، ئارام. (٢) پێشانی: ناوچاوان، تەوێڵ. (٣) لەپەسا: یەک لەدوای یەک، بەئیستیمرار. (٤) نایاب: بی وێنەیە، دەسنەکەوتوو. (٥) نیانەوە: ڕێکخستن و سازکردن، تەرتیب دان. (٦) زانکۆ: دانیشگاە، مەدرەسەی عالی. (٧) بۆی بچەلێ: بۆی بکرێ، بۆی ڕێکەوێ، بۆی بگونجێ. (٨) کۆڕ: مەجمەع. (٩) کەلامی ئەبەدی: قورئان. (١٠) ئاوازە: شوهرەت، ناوبانگ. (١١) جاڕ: جێگا، شوێن. (١٢) ئەحمەدی موختار، (موحەممەد)ص.

## شەیدا منم یا تۆ؟

بەڕاس ئەی زاهیدی خودبین بڵێ ڕیسوا منم یا تۆ؟
لە تۆ ساز و لە من سۆزی دەروون، شەیدا منم یا تۆ
لە من شۆر و لە تۆ شیوەن لە بەزمی مەی گوسارانا
دە بێ با ڕاس بڕۆین ناساز لەناویانا منم یا تۆ
کلیلی دڵگوشای یاران و نازاران لەلای کێیە
شەهیدی چاوی مەست و نەرگسی شەهلا منم یا تۆ
دەخیلی بێ ڕیای نازی خومارانی خەراباتی
لە کاتی دڵڕفێنی بازی تەڕلانا[١]، منم یا تۆ
قەباڵەی کوفری من بۆ وا بەئاسان مۆر ئەکەی زاهید
مەگەر عەیبە کە پێ بێی، بێ سەر و سەودا منم یا تۆ
دڵم دا، گیان ئەدەم، ڕۆحم بەقوربانی دڵستانە
دەسا لاساری[٢] بێ بڕوا، توخوا گومڕا منم یا تۆ
تەقەللای بێ وچانی من کە بەڵگەی پاکبازیمە
غەمم بۆ کەوتە کاریی[٣] تۆیە، بێ پەروا منم یا تۆ
بەسە ساقی لە مەجلیسما و لە خولدا بێ مەی و مینا
لەکارا بێ هەتا صوبحی ئەمەل، گومڕا منم یا تۆ
دڵم نەشکێنی یارا! نەک زیبانت پێ بگا دوور بای
لەناویا کێ جیای کاتۆ نیشان لەویا، منم یا تۆ
بەگیانی تۆ کە سەرپێچیم نەکرد هەرگیز لە فەرمانت
لە من ڕامی[٤] لە تۆ ڕەم،[٥] ڕاس لەپەیمانا منم یا تۆ
بەڕاستی مەستی پیاڵەی چاوی مەستی تۆ منم یا نا
ئیتر کەتمان هەتاکەی سا بڵێ (هێژا) منم یا تۆ

---

(١) بازی تەڕلان: بازی مێچکە کە بێچووی هەبێ. کە مەشهورە زۆر تیژباڵ و خوێنڕێژە. (٢) لاسار: ئینکار و لاڕێ و بێ گوێ. (٣) کەوتەکار: یەک کەوتوو. (٤) ڕام: مطیع، لینی. (٥) ڕەم: فیرار، طوغیان، یاغی.



## گوڵی سەر دەستە چینە

گوڵی سەر دەستە چینەی زیندەگانی
مەزەی پانایی گێتی و ئاوەدانی
بڵێسەی پڕ خورۆشی جۆشی هەستی
تەوانبەخشی جموجووڵی جەهانی
دەم و دووی تەمتەراقی خۆشەویستی
جەلای جەمگایی بەزم و کامەرانی
جەمال ئارایی بێ وێنەی طەبیعەت
پزووسکی مایەزای ئیلهامی مانی
شیفا بەخشی دەروونی داغی وێران
بڵێن نۆشدارووی ڕەنجی نیهانی
عیلاجی دەردی بێ ئامانی بیمار
تەوانبەخشی تەن و چارەی ڕەوانی
شنۆی نەرمی لەطیفی ڕازی عیشقە
بڵێم چی خەستەدڵ! ناشێ نەزانی
بڵێن کەی غونچە پشکووت و بزەی گرت
بەبێ گەردەی نەسیمی بەربەیانی
لەکوێ سووتاو گڕی گرت بێ نەوایێ
بە بێ چەخماخەیی ئەکسیری جوانی
بڵێسەی قەت نەسەند کانوونێ تاکو
بزووسکی داغی غەم هات کەوتە بانی
ڕەفیقان چیی نەکرد سۆزی مەحەبەت
لە عالەمدا چ بوو، بێ ئامیانی
برام! سەرمایەیی ژین عیشقە، عیشقە
ئەوی ڕێی لێ نەکەوت هیچی نەزانی

له هەستیدا ئەوی بێ مایە خولقا
نەبوون و بوونی یەکسانە، فلانی
لەدووی ئەکسیری ژین سەودای مەحەببەت
بڕۆن تا مولْکی ژینی جاویدانی
هەوێن شەرتی قەبوولە و ڕاستیی ئایین
وەفا زۆر چاک ئەزانێ ناوونیشانی
ئەوی (هێژا) بێ هەر ئەو ڕێیە ئەگرێ
بە سەودای ئەم جیهانی و ئەو جیهانی



## ئەکسیری ئەعظەم

له گەرمەی سۆزی سەودادا چ خۆشە شاد و خوڕڕەم بی
له ئایینی وەفای عیشق و هەوادا قوڕس و مەحکەم بی
له عەیش و نۆش و عوشرەتدا لەگەڵ مەستانی جامی مەی
کراوە و شیک و سەرحاڵ و فەرەح ئاهەنگ و بێ خەم بی
گەلێ شیرینە خۆش گوفتار و نیکوکار و زار پاراو
صەفابەخش و نەوانەرم و ڕەفیق لاوێن و سەرجەم بی
چ خۆشە نەشئە بەخشی بەزمی یاران بیت و تێکۆشی
فریشتەی سوڵح و دۆسی و ڕێنمای ئەولادی ئادەم بی
گەلێ شانازییە کاتێ لەناو کۆڕا حیسابت کەن
له شێوی شەونخوونی هاو پیاڵەی مەستی مەحرەم بی
چ ڕەوح ئەفزایە بۆ گیانت ئیجازەی دەن بوڵەند بفڕێ
لەگەڵ پۆلی فریشتەی کاکە شانا یاڕو باهەم بی
دە عاشیق کەم سکاڵا کە، لەدەس سووتن بناڵێنە
ئەگەر باش قاڵ نەبی پێویستە زێڕێکی عەیارکەم بی
دە زەممی سۆز و سازی عاشقان تا کەی ئەکەی واعیظ
له خۆڕا بۆ دڵت وا پێوە هەر نابار و وەرهەم بی
گەلێ فەخرە بەسۆز و ساز بنازی سوختەیی (هێژا)
بەڵام بۆ مایەکەی هەر چاوەڕێی ئەکسیری ئەعظەم بی

ئەگەر ڕازی مەی و مینا بزانێ زاهیدی مەغروور
بە تاوی تاسە گڕئەگرێ، بەسۆزی سینە دوورادوور
ئەمان لەوکاتە وا هەڵچێ و بجۆشێ خومرەیی ساقی
لەکوێ فێنک ئەبێتۆ وا خرۆشێ، بۆ شنۆی کافوور
تەمی جۆشانی وا تاریک و نووتەک کا دەمی ئاسۆ
کە ڕۆژی نیوەڕۆژت لێ بکاتە زوڵمەتی دەیجوور
مەقامێکی گرانە ڕازی سەودایی مەی و مینای
چ سەختە تا بگەیتە مەرتەبەی سەوداسەری مەنظوور
کزە و بۆنی هەناسەی گەرمی مەستانی جیگەربوریان
دەماغ پڕکاتەوە چزیانی چزڵیکی دڵەی خاپوور
لە کوورەی داغی سەرگەرما نەبێ تامی چییە سووتان
ئەبێ ڕەش هەڵگەڕێ شەیدا، لەتاوا عەینی کێوی توور
دە واعیظ کەوکەبەی کوانێ غەمی سەودا و دڵە و دوایی
ئەگەر وا تێنەکۆشێ تا، لە داری دەن وەکو مەنصوور
بە مەرجێ هیچ نەخوازێ غەیری دڵخوازی بە بێ باکی
(انا الحق) دابنێ گوستاخ، لەسەر داوخوازی سوور بێ سوور
بەدەم سۆزی بڵێسەی ئاور ۆ بانگ کا بە ئازادی
بڵێ شەیدام و سەربازم بەحوکمی قاعیدە و دەستوور
ئەبێ سوورم کەنۆ تاکو لە کڵ دەربێم و لایق بم
پڕم مەیکەن، بەخواجە و ساقی بمبەن بۆ سەرای مەخموور
لەوێش مەقبووڵی دیوان بم، بڵێن (هێژا) لە خۆمانە
بەجێیە ساقی مەی بێنێ و، نەوای نەی بێ و، سەدای سەمتوور





سوبحی جۆزەردان بەئارام بێ و بشنیێ بای شەماڵ
بێتە گوێت هاژەی شەتاوی نوقرە تاوی سەرنەهاڵ
نیوە بێدار مەستی بێنی «سوور هەراڵ» و «وەرکەمەر»
سامفۆنیی تاف بژنەوی، قەڵوەز[١] تەپ و تل[٢]، ناڵەناڵ
دیتنی نەخش و نیگاری دۆڵ و شیوی چی بڵێم
تیپی گوڵ خەمڵیوە، چەم پڕ ئاوی ڕووناک و زەراڵ
قووتی ڕۆحە قرمە قرمی تافی نرکەی قەڵوەزەی
دۆڵی «هەمرۆ دۆڵ»ی کاتێ دێ بەرەو ناو شیوی چاڵ
ئەیکوتێ وێنەی دو تەپڵەی سوارە، سوارەی خێڵە کورد
«کاکە بۆ»ی[٣] خۆشخوێنی «کۆسالان»[٤]، بەقی[٥] مەغرووری لاڵ
نازی «چێڵ»ی[٦] خۆشخەرامی بانی سەر کاو[٧] و، وەزەن[٨]
جوانترین «سامفۆنی»یە، دەنگدانەوەی «ئیکۆ»ی «نەهاڵ»
چرپە چرپی مێبەران و پیر و هۆڕی «کەلڕەم»[١٠]ی
گورپ و هەڵوێسان و لابازی بەرانی کۆنە ساڵ
چی بڵێم؟ «ڕێواسی خڕ»[١١]، یاقووت لە«پا»[١٢]ی پووز شیشە شیر[١٣]
ئەرچک و نازک لە وێنەی «ساق»[١٤]ی کیژی کرچوکاڵ
شیوی شاخ و داخی وەک دووکانی عەتتار زەرد و سوور
چینێ ئاڵ، چینێ بەنەوش، تیپ تیپ قەتارەی «سوورهەراڵ»[١٥]
«نەرگسی شەهلا» و «لالە» و «شیر هەراڵ» و «سۆسەن»ی
عیشوە دەفرۆشن گوڵی «نازاو»ی[١٦] خەمڵیو ئاڵوواڵ
«پیچک»ی لوول «قارچک»ی عەممامە[١٧] سان، «گەبڵە»ی زەریف
«شنگ» و «شیرین شاتەڕە»ی شوێنی هەرەسگای تەرتەماڵ
قودرەتی دیمەن نیگاری چیرە دەستان چی بکا
ئەسپی لەنگە و نایگەیێنێ سوواری پا خستووی خەیاڵ

بەسیە «هێژا» چەن دەکەی تاریفی نەقاشی سروشت
زاری «داقڵێشاو»ی[18] خامەی نووسەران تیا لاڵە، لاڵ

(١) قەڵوەز: تافی ئاو. (٢) تەپوتل: بە تلەوەبوونی دوو یا چەند شت ئەڵێن کە بکەون بەسەر یەکتریا. (٣) کاکە بۆ: اسم الصوتی «کەو»ە ئەڵێن کەوەکە کاکە بۆیەتی. گوایە کەو کە ئەخوینێ بە هەددامییانە ئەڵێ: «کاکە بۆ» واتە: کاکە وەرە! (٤) کۆسالان: فەرعێکە لە کێوی شاهۆ: پشت سەری «دوورِۆ» و «ڕەزاو». (٥) بەق: نێرەکەوە، بەقی لاڵ بەو نێرە کەوە ئەڵێن کە ماوەیێک لە چێڵ واتە ماکەو دوورکەوتبێتەوە. (٦) چێڵ: ماکەو. (٧) کاو: کێوێ کەوتبێ بەبەرا (وەرە سپۆڕ بێ). (٨) وەزەن: پەرتگای کێو (شاخ). (٩) نەهاڵ: تەرتەماڵی بێ دار و بنچک. (١٠) کەڵڕەم: ڕانی بزنە کێوی. (١١) ڕێواسی خڕ: بە ڕێواسێ ئەڵێن لە جێگە زیخەلانا بێ کە ساقەکەی درێژ و سپی و جوانە چونکە زیخ سەری داپۆشیوە و خۆر نەیگەستووە. جا زۆر نازک و سپییە. (١٢) یاقووت لە پا: وەکو ئەزانن بێخی ڕێواس کە ئەچێتە سەر کۆتەکەی سوورە. (١٣) پووز: پوزی وەکو شیشەی پڕ لە شیر وایە. ڕێواسەکە وا سپی و لەطیفە کە تەشبیە ئەکرێ بە شیشەیێ پڕ بێ لە شیر وەک پووزی کیژی کاڵ. (١٤) ساق: ڕان. (١٥) سوور هەراڵ: گوڵێکی ڕەنگاوڕەنگی بۆن خۆشی کوێستانی شاهۆیە. (١٦) نازاو: تەرچک و ئاودار. (١٧) عەمامەسان: قارچکی سپیی گەورەی کوێستان مێزەری مەلا تشبیە کراوە. (١٨) قەڵەم هەمیشە زارەکەی واتە نووکەکەی داقڵێشاوە.



## لەگەڵ فیطرەت بە

وەرن مەستانی ناوچەی بێنەوایی[1]
وەرن ڕزگار لە داوی من منایی[2]
وەرن ئاسان بژیوانی تەماعی
وەرن شێتانی شەیدای بێ هەوایی[3]
سەرم سڕما لە ڕازی بیر و ڕاتان
هەڵەی چۆڵی جییایی[4] و ئاشنایی؟
بە ڕۆژ بۆ گۆشەگیری کێو و شیون
بە شەو بۆ تا سەحەر نەوحەسەرایی؟[5]
شەبستان[6] و ڕەواقی شاری مەستان
پڕی موشتاق و سەودایی[7] و فیدایی
لەوێن گشت جورعە نۆشانی خەرابات
لە موطریب نەی، لە ساقی دلڕوبایی[8]
چییە ئەی چۆڵنشینی خاکی ئایین[9]
لەگەڵ فیطرەت دەکەی زور ئازمایی؟
دە لەذذەت بە! لەوەی پێی داوی داوەر
چ بێ حیکمەت نییە دادەی خودایی
کەریم کەی مەرجی دانا کاتی بەخشین
وتی: نەیدەی لەمەڕ موشکیل گوشایی؟
هەڵەی بەرچاوی تەنگت تار ئەبینێ
دە وەرچەرخێ! دەمێ بۆ ڕەوشەنایی
کە حاڵیت بێ کەرەم کۆڵاوە[10] یەزدان
دەڵێ: تۆ سەربەخۆی، تاکو دوایی!
حەزت لێ بێ کە ڕزگار بی، ڕەوایە
لە ئالایش[11] بەدوور بیت و، ڕیایی

بڕۆ ئاسان و سادە ڕایبوێرە
لە خۆت سەخت مەگرە، بگرە ڕێی برایی
دەسەومل بە لەگەڵ گەورە و بچووکا
لە میهری خەڵکیا ڕازی[12] ڕەزایی
کە وا بووی گشت ئەڵێن: خۆزگەم بە مەستان
لەگەڵ جەمعان و، نازانن جیایی
ئەوی «هێژا»بێ گوێ ئەگرێ لە پەندت
دەپارێزێ لە ئەتکی بێوەفایی

---

(١) بێ نەوایی: لاقەیدی و بێ دەربەسی. (٢) من منایی: خودخواهی، خۆپەرستی. (٣) بێ هەوایی: بێ هەدەفی. (٤) واتە: هەڵەی بیابان و چۆلی دوورگرتن و خۆشارینەوە، چییەتی بەسەر دۆستی و ئاشناییەوە. (٥) نەوحەسەرایی: شیوەن و لاواندنەوە و زاری. (٦) شەبستان: بە تارمەی درێژی پشتی ڕەواق وێژراوە. (٧) سەودایی: واتە دڵبەستە. (٨) دڵڕوبا: دڵڕفین. (٩) خاکی ئایین: خاکی طەبیعەت. (١٠) کەرەم کۆلاو: کەرەم فراوان و بێ حیساب. (١١) ئالایش: ئالودەبوون بە ڕەوشتی ناپەسەند. (١٢) ڕضاء الخالق ڕضاء المخلوق: واتە ڕەزامەندیی خالق لە ڕەزامەندیی خەڵکایە.



## بەربەیانی عیشق

تەرجەمەی قەصیدەییێکی سەعدیی شیرازییە

کوا لە دەورەی عیشق خۆشتر ڕۆژگار
کەی سبەینێی ڕوون ئەبینێ شێوی تار
سازە ناساز صۆفی گەرمی ڕابیطەن
عیشقە زوو خێزە و، سەرئەنجام نادییار
بۆ هەموو خۆشکامێ پایانێ هەیە
ئەهلی دڵ کوا کەیل ئەبێ و ئەگرێ قەرار
ناو هەزاراندا یەکێ ڕاز ئەژنەوێ
نادرن چون، مەحرەمانی ڕازدار
ئاشناکان ڕێ بە ئەو مەعنا دەبەن
کۆشکی شەخصی تەنگە بۆ جەنجاڵی شار
تا نەسووتێ، بێنی کوانێ چێوی عوود
کڵ دەزانێ نرخی خام، بابیی عەیار
هەر کەسێ دڵخوازی جۆرێ ناو ئەنێ
من کە بۆم تایین نەبوو نازناوی یار
لێ بزانی شۆری سەرمەستی منم
دەردەدار ئاگای لە دەردە و دڵفگار
بای بەیان و خاکی ئێران ئاورین
دەردمەند ئارامی کوا و شام و نەهار
«سەعدییا» گەر بوت شکێنی خۆت مەبە
بوتپەرەستە خۆپەرس «هێژا»ی هەژار

## تیپی مووسیقای بەزمی تالار

بوتی تەننازی بوتخانەی بەهاری[١]
هەڵۆی تەڕلان[٢] و شابازی شکاری
لە وێنەی سەروی شەنگ و شۆخی ئازاد
نەمامی، قامەت و سیمین عوزاری[٣]
سەحەر کاتێ کە شنیا، شیک و مەوزوون
بەرەو گوڵزاری بەر کۆشک و تەلاری[٤]
ئەلەریاوە قەدی شەمشادی شادی
سەراپا، ناز و عیشوەی لێ دەباری
دڵی بردم بەتالان بازی تەڕلان
دو چاوی مەستی، شاهێنی[٥] شکاری
کە دیلی بردە ناو تالاری سەودای
وتی: ئازادی لێرە ماندگاری
لەگەڵ جووقەی نەوا و ئاهەنگی مندا
بڵێ ڕازانی سەودای دڵفگاری
ئەسیر پرسی کە: دەستەی ساز و ڕاز کێن؟
وتی: پۆل پۆل هەزار قومری و کەناری
بەڵام یاساخە سۆزی بێ ئیجازە
لەوێ وریا بە مەنعە شین و زاری
لەگەڵ سروەی نەسیما دەم بەیانی
حەزم لێیە نەوای نەرمی «تەتاری»[٦]
دەمی لیزگی هەتاو «خورشیدی»[٧] خۆشە
«قەتار»ی کوردی بۆ کاتی خوماری[٨]
لە مەغریب زایڵەی[٩] «لاوک» زەراڵە
لەکاتی نووستنا «خاوکار»[١٠]ی کاری



لە عیشادا سەدای «قانوون» و «سەمتوور»
بە ئاوێتەی «نەوا» «شۆر»ی سێ تاری
لەکاتی نیوە شەو «ئای ئای» و «ئایران»[١١]
کە هەستێنێ لە خەو «حەیران» نیگاری[١٢]
سەحەر پێویستە ئاوایی «سەحەر» بێ
نەوای نەرمی نەی و چاچای کەناری
کە پیقەی «دووزەلە»و «سوڕنا» و «دەهۆڵ»یش
لەڕەزما دییارە بایی و ئیعتیباری
ئەتۆش ئەی بولبولی دڵ ناڵە ناڵت
لەناو تیپی هەواما دیارە، دیاری
دڵت تەخت[١٣] و ڕەوان ڕۆشن بی بەستە
کە ئەندامی دەسەی بەزمی تەلاری
بڕۆ هەر جۆرێ سۆزت[١٤] سازە بێژە
نەوا و ئاهەنگی عیشقی و بێ قەراری
نەڵێی دیل و هەژار و کەیلی (هێژا)
کلیلی ساز و سەمتووری خوماری[١٥]

---

(١) بەهار: گەورەترین و جوانترین بوتخانەی «هندستان». (٢) بازی میچکەی بێچوەدار، بازی تەڕلان. (٣) عوزار: ڕوومەت. (٤) تەلار: ئەیوانی گەورە. (٥) شاهین: نەوعی هەڵۆی تیژباڵ. (٦) تەتار: ئێلێکی گەورەی تورکە کە قەتاریان وتووە. (٧) خورشیدی: پەردەیێکە لە قەتار. (٨) بەینی خەو و بێداری یا مەستی و بێداری. (٩) زایەڵە: نەوا. (١٠) خاوکار: پەردەیێکی تری قەتارە. (١١) ئایران: هەر ئەوەیە کە ئێستا حەیرانی پێ دەڵێن. (١٢) نیگاری: دەستەیێکی لە ترياكییەکان کە سەبیلەکەیان نیگاری پێ دەڵێن. (١٣) دڵ تەخت: مطمئن. (١٤) زەمزەمەی دڵگیر و گەرم «سۆز». (١٥) تامەزرۆی موخەددیرات یا موسکیرات، خوماری پێ ئەوترێ.

## چەرخی چەواشە

له چەرخانی چەواشەی گۆیی گەردوون
پەکەر دامام و بەزیام بێ چەن و چوون
له دەعیە و فیز و ئەتواری بەگ و بۆر
هەراسانم کە تووش[1] و توند و بەدخوون
عەجیبە، وا ئەزانن گەنجی گێتی
ئەبێ بڕواتە کیسەی بێ فەڕ و دوون
دەغەڵ لای وا نییە خەڵکیتریش هەن
بە خۆ خەڕە و تەماعی و لووسی نازوون
ئەگەر لێت پرسی: چیت زیادە لە عالەم
ئەڵێ: دارایی «دارا»و گەنجی «قاروون»
کەچی تێی هەڵدە، عانەی[2] لێ مەسێنە
دژی ڕاسی و غولامی مەکر و جادوون
ئەڵێ چون پارە دارم میری شارم
قسەم ئەڕوا بە زۆری زێڕ و ئاڵتوون
بەسەریا ناچێ مەنگی گێژ و ناران
بە زۆری بازوو هەڵکەوت خان و خاتوون
ئەگەر بازووی کرێکار ڕابووەستێ
گرۆی خەڕەی دراو موحتاجی پاروون
بە زۆری بازو دونیا ئاوەدانە
بە صەنعەت ساز بووە هەرچی کە چابوون
وەرە ئەی نەوجەوان! هۆشیار بە، بێدار
مەچۆ ڕێگەی ئەوانەی وا خەتا چوون
نەنازی قەت بە پوول و پارە تەنیا
بەعیلم و ڕەنج گەلان سەر بەرز و زیندوون



ئەوانە گشتی پێویستە کە پێکۆ
بەجاریٚ بێنە کایە[3] ڕێک و مەوزوون
قەباڵەی بەختیاریت بۆ بنووسن
بە کار بەن گەوهەری هەستان و خۆبوون
ئەگەرنا پوول و پارە و فیز و دەعیە
سەرئەنجامی فەنایە و مەحو و تیاچوون
وەرە وەک خاکی داکەوتوو بە (هێژا)
لە خۆ ڕازین ئەوانەی مەنگ و خەوتوون

---

(١) شەڕفرۆش: تووش. (٢) عانە: چوار فلسی عێراقی؛ دینار هەزار فلسە. (٣) بێنە کایە: بکەونەکار.

## پڕ پەیمانە

ئەو دەروونە کاولە، جۆش و خرۆشی تیا نەبێ
ئەو دڵە ویرانەیە، هێلانەیی ڕوئیا نەبێ
ڕۆحێ وا پەرواز نەکا بۆ پشتی پەردەی کاکەشان
ئاشنای ڕازی نهێن و کەوکەبەی شەیدا نەبێ
قیمەتی کوا، گیانفیدا تا خۆی لە پشتی پەردەوە
وردەبین و نوکتەزان و زیرەک و وریا نەبێ
ئەر دڵێ گەرم و خرۆشان و پڕی سەودا نەبێ
چیی تیایە داد و فەریادێ کە بۆ لەیلا نەبێ
کوا دڵ ئەگرێ ساز و ڕازێ هی دەروونی داغ نەبێ
شۆری شەیدایی لە کوێ بوو عاشیقێ ڕیسوا نەبێ
عیشقی جانانەم دەوێ، هەر موشتەریی زەوقم ڕەفیق!
دڵ لەلای مەستم ئەوێ، نادان مەڵێ: با وا نەبێ
دڵ ئەگەر کەیلی پیاڵەی مەی نەبێ چیت لێ دەوێ
شۆری بێ مەستی بەڕاسی هەر دەبێ ئەفسانە بێ
بۆ برافی بەزمی گەرمی ساز و سۆزی ئەهلی دڵ
مەجلیسێ کاتێ کە بێ، پێویستە پڕ پەیمانەبێ
موختەسەر تا بێمە سەرحاڵ شۆرمەوێ[1] و جەذبەی بەکوڵ
ساز و ئاوازی وەها پێویستە هیی دێوانە بێ
ئەو هەوا دڵگیر و گەرمە وا لە گیانۆ بێتەدەر
لای ئەوەی زەوقی هەبێ غەوغا ئەبێ ڕیندانە بێ
مەستە (هێژا)، ڕاست و ڕووت خۆی جارِ ئەدا مەنعی مەکەن
چۆن ئەبێ بەو حاڵەوە بەر باری لۆمە و تانە بێ

(١) شۆرمەوێ: شۆرم ئەوێ.



## زایەڵەی زەنگی ئاشنا

دەنگی زەنگی کاروانێ دێتە گوێم
ئاشنایە، زایەڵەی[1] زۆرخۆشە پێم
تۆ بڵێی سەر قافڵەچی یار بێ کە من
پێم وەها بوو دڵگرانە و زیزە لێم؟
ئاخۆ گەش بووبێتەوە پشکۆی ئەوین
ئاهی ساردم[2]، گرتبێتی چی بڵێم؟
سەر لەنوێ سوور هەڵگەڕابێتۆ سکڵ[3]
یار پەشیمان بێ لەوەی کردوویە پێم
ئاشتی بووبێتۆ لەگەڵما دڵبەرم
تۆ بڵێی تا ئێستەکەش خۆشی بوێم؟
پایەنازی قافڵەکەی کەم گیان و دڵ
قۆچی قوربان بم لە بەر پێی سەربرێم
تا بزانێ بێ چەن و چوون خەستەیم
یەک بزووسکم پێ دەوێ تا هەڵگڕێم
یەک شنۆی ئارام و یەک سووسەم بەسە
سەر لەنۆ تاو بگرێ کوورەی تاوو تێم
گەرمیی کانوونی[4] دەروون وەک خۆیەتی
ساردیی ئەو کەی چار ئەکا سۆزی بەجێم
گیانفیدا ئەر بۆ جەفا کۆڵی نەدا
ڕووی هەیە و شایستەیە[5] بێژێ کە کێم
خەڵکە لاتان سەیر نەبێ میهر[6] و جەفای
قافڵە سالار حەقیە هەرچیی لێ بوێم
نازەنینە و نازئەکا دڵخوازی من
تا بزانێ چی ئەکەم، یا چی ئەڵێم

سـەد کـەڕەت بیـسـتـوویە تـەسلیـمـم وەلێ
وا کــە یاســای دلبــەرە، دردۆنگە[٧] لێم
مـن بە نـاز و گـیـروگـازی کـەیف ئەکـەم
دڵ لـەلام (هێـــــژا)م وەهـام چـۆنـی بوێـم

(١) زایلـە: دەنگی زەنگی کـارەوان. (٢) ئاهی سـارد: بەو مـوناسـەبەتەیە کـە بای سـارد زوو پشکۆ ئەگەشێنێتـەوە. (٣) سکڵ: پشکۆ. (٤) کانوون: ناو کرۆک، ناوەڕاست. (٥) شایستـە: لایق، پێ شیاو. (٦) میهر: خۆشەویستی، محەبەت. (٧) دردۆنگ: تەردید، دووشک، ظەنین. حذر



## ئەی ساقی

وەرگێڕراوی قەصیدەیەکی بەناوبانگی حافظی شیرازی (الا یا ایها الساقی)یە

وەرە ســاقی پەیاپەی[١] مــەی بگێــڕە و تێکە بینۆشین
ئەوین ئاســانە[٢] ئەووەڵ، مــوشکیــلاتی زۆرە بیــزانین
بە نەشـئـەی هەر گـرێی زوڵفی نەسـیم شـێـوانی، تێکی دا
لە مـوشکین[٣] ئەڵـقـەیی ئەگـریجـەیا ، گـیـرن دڵان خـوێنین
لە کـۆشکی خـۆشـەویسـتـانا ژییـان کـەی خـۆشـەپەی دەرپەی
زڕەی زەنگێ زەراڵ بانگ کـا ، درەنگە بارگــە هەڵپـێـچین!
ئەگەر پیری موغان[٤] فەرمووی، بە مەی سەججادە ڕەنگین کە
یەقین ســالیک[٥] لە ڕێگا شــارەزایە و ئێــمــە نایزانین
ئەگـەر کـێـشـایە لای ڕیسـواییـیـۆ ڕەفـتـاری خـودخـواهیم
لە کـوێ پەنهــان ئەبێ ڕازێ، لە کــووراندا بێ بێ پەرژین[٦]
شــەوی تاریک و بیــمی گـێــژەڵووکــە و تۆف و بۆران کێ
دەڵێ هۆشـیــاری ئێــمــەن خــۆشنشــینانی بەهاری ژین؟
ئەگـەر ئەتوێ لە کـوورکەی[٧] یادی یاران، لا نەکـەی (حافظ)
بە دڵخـوازت کە شـاد بووی شەرتە لەم دونیـایە دەسشـۆرین[٨]
وەرە (هێـــژا) دەسی لێ هەڵگـرە، بێ مـــایەیە و پووچە
لە غــەیری جـام و مـەی شـایسـتـەیە جـانانە چاوپۆشین[٩]

(١) پەیاپەی: لە سـەریەک، یەک لەدوای یەک (اسـتـمـرار). (٢) عـاشق بوون: سـەرەتاکـەی کـارێکی طەبیعی و ئاسانە: بەڵام موشکیلاتی لەوەودوای دوایی نایێ. (٣) موشک یا میسک. بون خۆشێکی بەناوبانگە، بەڵام حافظ لەو بەکاربردنەدا بەتیرێ چەند نیشانی شکاندووە، ڕەشیی میسکەکەو ئەڵقەی زڵفی ڕەش، عەطری میسکەکە و عەطری مووی یار، جا پاشان ئەڵێ ئەو عەطر و شەوەزەنگە کارێکی کرد کە هەزارانی گیرۆدەی زەنجیری زڵف تاریکستان کرد، وە هەزاران دڵی خوێناویی لە زەنجیری زڵفا دیل کرد. (٤) پیری موغان: یەعنی سەرۆکی موغەکان، موغان ئایینی ئێرانییان بەر لە زەرتووشتی بووە جا واتە ئەگەر سەرۆکی خوا پەرستان پێی وتی جانمازەکەت لە مەی هەڵکێشە مادام خۆت پێ سپەردووە

بەگوێی بکە. (٥) چونکە ئەوانە لە ڕێگای مەسلەکەکەی خۆیان باشتر شارەزان وە ئێمە وەک ئەوانی لێ نازانین. (٦) پەرژین بەو حەصارە دڕک و داڵە ئەڵێن لەدەوری مەزاردایە، دیارە ئەو پەرژینە نەبێ زەراعەتەکە تیا ئەچێ: واتە ئەگەر خودخواهی (حب الذات)ی من لەتام دەرچێ ئیتر پەرژین و مانیعێکی تیا نامێنێ بۆ ڕیسواییی من. (٧) کوورکەی دەروون: لە قووڵایی دڵا. لە ئەعماقی دەروونا. (٨) دەس لێ شۆرین: واتە دەس لێ هەڵگرتن و واز لێ هێنان. (٩) چاوپۆشین: لەبیرخۆبردنەوە و تەرک کردن.



## ئێرەتیی ژین

لە دەس چەرخی فەلەک ئازادە کەی نالاَندی، خەڵکینە ئەوی سەر دانەوێنێ بۆ جەفای، بێ حاڵە، نەنگینە لەکوێ گۆشتی خوراوە بازی تەڕلان و هەڵۆ، بێژن تووانج و تانە بۆ شێری ژییان سەنگینە، پاییینە مەگەر مەردە ئەوەی ئەم چەرخە ڕازی بێ کە ئەتکی کەن تەواو بوو بێ نەوای دوێنێ کە ئەمڕۆ قورس و سەنگینە بزانە شێری بێشە و جەنگەڵی ئەمڕۆیە کاکەسیا من و تۆیی لەگەڵیانا خەتایە و دژ بە ئایینە دەسا جاڕ دەن، بڵێن ئۆخەی تەواو بوو من منی، ڕۆیی بدەن مۆژدە کە با ڕووی خۆپەسەندی نەختێ پەرژینە پەڕ و باڵی پڕووزا طەیری عەنقای بەرتەری، بێژن ئەوی ئینسانە یەکسانە، پلە و پایەی بە کۆشینە بە زانین و هونەر ئەتوانێ ئەندامێ بڵێ من کێم وەرن تا ئیمتیحانم کەن، کە مایەم عیلم و زانینە لە بان گشتی ئەوی وریا بێ بەو زانینە نانازێ ئەڵێ (هێژا) هونەر هیی خەڵکە لای من ئێرەتی[1] ژینە

---

(١) ئێرەتی: ئەمانەت

## بزێو

مـانیـاوی بەرەو ژووری جەفـام بۆیە پەشێـوم
شـــێـــواوم و زریاوە لەتاوان دەم و لێـــوم
دوودڵم و سـەراسـیـمـەم و حـەیران و شپـرزەم
وەیلان و پەرێشـــانم و هەردەی کـەژ و کـێـوم
ئاسـۆیی نەجـات بۆتە نەزەرگـایی نیـازم
یادی بوتی ڕەعنایە خـدێی شـامم و شـێـوم
لات وا نەبێ، بێکارەم و بێ چارە و سـسـتم
بڕوات بێ لە پاسی هەدەفـا خـەیلێ بزێوم
هیچ شک نییـە لەو بابەتەوە، کێ بێ نەزانێ
بۆ بەزم و هەوا و شـۆری نەوا مـیـر و خـدێوم
عـامـفـامـە ئەسیـرم لە شەوەی ئەڵقەیی زلفا
ئەتوێمۆ بە تاوی شەمی ئاوات، وەکو مـێوم
تاوتوویی مەبەستی سەری سەودایی بەچی کەم
مـەینەت زەدەیی سـەخڵـەتی هەوراز و نشـێـوم
هێند مـاندوو و ڕەنجوورە تەنی مەینەتی ئێژی
تاپۆیێ لە ئێسـقـان و مـوقـەووا و چڵـو چێـوم
تاریکە سـەرئەنجـامی تەقـالایی نیـیـازم
سەرگەشتە، بیابانی جەفای مەتڵەب ئەپێوم
(هێـژا)م، گـەلێ وریام و ئەڕۆم، نابەزێ ڕۆحم
ئازادم و بێ باکم و دەربەس دژی خـێــوم[1]

---

(١) خێو: مێردەزمە، دێو، صاحب.



## گۆمی خوێن

گـۆمی خـوێنە ئەم جـەهانە، شـووم و شـێـواوە، بەپێی
مەکتەبی کوشتـار دەچەرخێ کـاری بێ جێگاو و بەجێی
شـەڕفـرۆش فـەرمـانڕەوا، مـوجـریی حکوومـەت تێـغی تێـژ
تۆپ و تانگ قـانوونی دەوڵـەت، قـەتڵ و تالآن ڕەسم و ڕێی
مـەسلەکی وێرانگەری و کـوشـتـار پەسـەندە واعـیـظا!
ڕازی مـانـیی لێ ئەفـامـێـتـۆ دەغـەڵ، تۆ چی دەڵێی؟
کـەی عـیـلاجی مـێـشـکی وا بیـمـارە دەرسی فـەلسـەفی
مـەنطیق و حـیکمـەت لە کـوێ تەئثـیـر ئەکـاتە خـوو خـدێی
بۆمی کـــیـــمـــاوی بەکـــاربردن دژی خـــەڵـکی هەژار
لای مـەبەسـتێ عـادییـە و کـارێکی یەکـجـار چاکـە پێی
خـاک و خـوێنی کـێـوی هەورامـان، «بیـارە» و «باغـەکـۆن»
«شارەزوور»، «خورماڵ»، «هەڵەبجە» تا «تەوێڵێ» دێ بەدێی
گـــشت نومـــایشگایە بۆ ئایینی حـــوکـــمی زۆرملی
ئارمی خـاک و خـوێن نیـشـانە بۆ مـەرامی کێ بەکـێی
گولله تۆپ، «ژاندارمە»، «بۆمبا» قـازی، «خەردەل» حاکمە
ناصیحی بێ چارە! نووستووی، داچڵەکێ! یا هوو لە کوێی؟
لافی دڵسـۆزیی گـەلان، مـافی بەشـەر، دەعـیـەی درۆ
تا بە کـەی مـەردم فـریب! سـەرگـەرمی مـەکـر و پاقـژێی
سـازمـانی «ئەمن» و «لاهە»، دادگـای پووچی گـەلان
کـوێر و کـەڕ بوون یا نمەکگیـر بێنی نەوتی خـانەخـوێی
گـەر لەلاتان وایە، مـەسـئوولان، هەمـوو ئەم عـالەمـە!
گـــشـــتی نادان و سـڕ و مــەنگە، هەڵەی وای دابنێی
بێنی نەوتت هاتە لووت خـێـرا بەتاو زوو لنگ ئەدەی
ئەر مـەترسـیی مـاددیی خـۆتی تیـا نەبێ هیچ نابیـێی

عارە، ئەتکە چاو بەس و نەیرەنگ، ئیتر تا کەی ستەم
زوور و تەزویر و ڕیپیا و جامبازی بەس بێ تێر بە لێی!
ڕەنگە پێت وابێ لەعالەمدا هەیە هێمان گەلێ
دانی خێرت پیا بنێ و بێ ترسو بیم خۆشی بوێی؟
ڕاچەنێ بەو خوێنە ناحەق ئەیرژێنی، وا نییە
ناعیلاجە، لێت ئەشارێتۆ دڵ و جەرگی توێی
ئەو ئەترسێ، تۆش بە مەنگی دائەنێی، مەستی هەوا
تۆ هەڵەی، ئەو سەهو ئەکا، (هێژا) بڵێ تۆ چی ئەڵێی!؟



## پشکۆی گەش

چی بکەم، شەوو ڕۆژ مات و پەرێشان و خەرابم
سەودایی یو مەست و پەکەرم، پاکە حیسابم
ئەو تیشکە کە ئەدرەوشێ لە کوورکەی دڵۆ ئاخۆ
پێی ڕازییە ڕازداری دڵ و جەرگی کەبابم
ئایا مەلەکەی ڕۆح سەرەڕای سۆزش و سازش
لای وابێ کە شایستەیی سەرچەنگ و عیتابم؟
ئاخۆ بە قسەی سارد و سڕی کۆنە ڕەقیبم
بڕاوای هەبێ من مەستی مەی و جامی شەرابم
پێم وانییە ئەو غەدرە قەبووڵ کات و نەفەرموێ
بێ چارە دەخیلی منە تا نەدرێ عەزابم
ئازادە سەرێکیش لە خەراباتی بدا تا
بۆی دەرکەوێ لەو تاقمە شا عالی جەنابم
سەرگەردی قەد و قامەتی دڵخواری نیگارم
ئەیزانێ نەوای ڕازی ئەوین، ئێژێ ڕەبابم
وا باشە کە مەستانە بڵێم ڕاز و نیازم
بێ دەربەسی تانە و تەشەر و ڕەیب ڕیپیا بم
تا کەی لەبەری تانەیی نادان و ڕەقیبان
پشکۆی گەشی شاراوە لە بن بووڵە مڕا بم
من داغم و گەرمایە بەش و بارەیی زاتیم
جێی خۆیە کە مایەم چییە، بێ پەردە وەها بم
ئاواتی دڵم هەرچی هەیە وا بم و بێژم
(هێژا)م و غەرامم وەطەنە بۆ هەبەسابم

## دەسخەرەی هات و نەهات

تەریدەی دڵرفێن و یاری دێرین
دڵت بردم بەتاڵان شۆخی شیرین!
بنە و بارگەت بەرەو گەرمێن ئەچێتۆ
وەکو خاقانی چین بۆ موڵکی ماچین
وەرە ئێمەش دەمێکە چاوەڕێتین
تەماداری یەکێ دوو دانە ماچین
یەقین، سالاری موڵکی سەرفەرازی!
هەتا تەشریف نەهێنی لێرە ناچین
سەراوە و ساقییە و سازە و مەی و نەی
دە لادێ لادە! ئێمەش گیانفیداتین
لە گەرمێنی دڵم خیوەت بەپاکەین
بەڕاستی و بێ ڕییایە دڵ لە لاتین
سەر و ماڵ و دڵ و خاوەن دڵ هەر ئان
قەدەم ڕەنجە بفەرمووی خاکی پاتین
زەریفە تۆر و هەڵوێست و بیانووت
شەکەر ئەشکێنی شیرین شارەزاتین
لە کوورەی گەرمی خێڵی سازو سەودات
نەوامان داغە، مەست و دڵنیاتین
گەلێ موشتاقە (هێژا)، دڵ لە دواتە
دەمێکە دەسخەرەی هات و نەهاتین



## تەسلیم

چلۆن ئەی نەونەمام، ئەی شۆخی سەرمەس
بەجێیت هێشتم مەلوول و زار و بێ کەس
لە طوفانی زەبەندی کێوی عیشقا
ڕەوایە جێ بمێنم دەس لە بان دەس؟
کە خۆت زۆر باش ئەزانی چەن پەشێوم
عیلاجی دەردەدار لای ئێوە سادەس
مەلێ زۆرن لە موڵکی سەڵتەنەتما
پەشێوی کۆن و سەرگەردانی نەوڕەس
ئەگەر فەوتای، یەکێ تر دێتە کایە
ئەسیری نازی من هەر تا بڵێی هەس
بە غەیری من لەکوێ دیت سۆز و سازێ
دڵی شێرێ ئەسیر کا زار و دەربەس
لە من چاکتر دەزانی ئەی نیگارم
بەڵام خۆ وێڵ ئەکەی ناحەق دەس ئەنقەس
لە جەرگەی دڵبراوانا نموونەم
مەدە ڕەنجم، بەسە ئەی شۆخ، ئیتر بەس
لە گیانم چیت ئەوێ تەسلیمە (هێژا)
ئەسیری تۆیە بێ دەسبەند و حەس

## وەیشوومە

وەیشوومەیە، شێواوە وەلات داخی گرانم
وێرانەیە، فەوتاوە وەڵات داخی گرانم
ئاژاوەیە، خوێناوە وەڵات داخی گرانم
طۆفانییە، لافاوە وەڵات داخی گرانم

***

وەیلان و پەرێشانی ڕەوە خەڵکی وەڵاتم
سەرسام و هەبەسیاوی هەوە خەڵکی وەڵاتم
ڕۆژی تەم و تاریکە شەوە خەڵکی وەڵاتم
پژگاوە، نە خوردە نە خەوە داخی گرانم

***

زامار و پڕ ئازار و برین جەستەیی خەستەی
کوتیاو و، زەمین گیری ڕەمین جەستەیی خەستەی
پێکراوی سەری تیری نەوین جەستەیی خەستەی
پەککەوتوو و داماو و حەزین، داخی گرانم

***

ئاخۆ چڵ و چووزەی گوڵی من ئێستە لەکوێ بێ
ساوای کوورەکی ناو دڵی من ئێستە لەکوێ بێ
ئارامی تەنی پڕ چڵی من ئێستە لەکوێ بێ
ژاکاندی زەلان سونبولی من، داخی گرانم

***

پێ خاوسە کیژۆڵەیی کورد، جەرگی بڕاوم
ناژنەوێ هەرا و ناڵەیی کورد، جەرگی بڕاوم
کەس کوانێ لە دووی تۆڵەیی کورد، جەرگی بڕاوم
خامۆشە نەوای ڕۆڵەیی کورد، داخی گرانم

***



داکی کوڕی کورد شیوەن ئەکا، پشتی شکاوە
لاوی گەلی کورد غەم شەن ئەکا، پشتی شکاوە
شینی سەروماڵ و تەن ئەکا، پشتی شکاوم
دوژمن بە مەرام گۆبەن ئەکا، داخی گرانم

***

تالآنە کەلوپووری گەلم، کوردە، هەتا کەی
دوژمن پەلی کا باڵ و پەلم، کوردە، هەتا کەی
لای وابێ کە بێکار و کەلم، کوردە، هەتا کەی
بازیچەیی دەستی دەغەڵم داخی گرانم

***

کورد قەییمی کەی ویستووە، با خەڵکی بزانێ
کورد خەیمەیی کەی ویستووە، با خەڵکی بزانێ
کورد سەروەری کەی ویستووە، با خەڵکی بزانێ
پیلانە ئەوەش نەیویستووە، نا، داخی گرانم

***

کەی خواستی لەعەرزی وەطەنی دەستەسەری کەن
کەی ویستی لە مێرگ و لە جەنا چارەسەری کەن
بێگانە بدا پاسی دەنا دەربەدەری کەن
(هێژا) نە عیلاجە و نە پەنا، داخی گرانم

# هەڵەبجە

١٤٠٩هـ.ق.

بڵێن با لالە نەڕوێنێ و گوڵی سوور
بەرینی شارەزوور، خاپوور بێ خاپوور
هەڵەبجە مەرکەزی جوامێری جافان
هەرێمی ئەهلی تەقوا و دانیش و نوور
هەڵەبجە شاری خێڵی سینە صافان
بە ئازایی و وەفا و خواجۆیی مەشهوور
دە گۆڕت هەڵتەکێنی (خانم)ی کورد
ئەمیرەی کوردسانی، شێری مەستوور
لە گۆشەی گۆڕۆ سەیری شارەزوور کە
دەسووتێ وشک و تەڕ نەزدیکی تا دوور
بڵێ دەسگەل قەڵاخی کەن ژنانی
چەمەر لێدەن لەباتیی ساز و سەمتوور
«شیبیە»و «ڕەشکوێت» و «بۆرە» زین نەکرێ
دەخیلە خێڵ نەچێ ئەمساڵ بەرەو ژوور
کەژ و گوڵگەشتی هەورامان پڕووزا
بە هێنای گازی خەردەل، ژاری کافوور
بڵێن فەقیانە شین کەن لاوی ئێمە
لە خوم دەن چارەکەی کیژانی مەغروور
بڵێن با ڕەشدەوار بەرپا نەکرێ
نەچێ گاوبار بەرەو پاکێوی باکوور
لە کۆلاراوی شینی شارەزوورا
هەرگ پێوانە باکوور تاکو باشوور
بڵێن با نەونەمامان پەلکە پەی کەن
قەلاخی[٢] کەن کوڕی خاڵ و کچی پوور



ستەمپیشە و شەڕوورە دوژمنی کورد
ئەگەر وێرانگەرە مەئموورە، مەئموور
لە ئێلاخان هەرایە و شین و ڕۆڕۆ
دەچۆڕێ خوێنی گۆنای ئاڵ، گوڵی سوور
سپاهی کورد قڕان زوو سان دراوە
کە یۆڵغار کا بەرەو خوار و بەرەو ژوور
بسووتێنێ دەر و دەشتی وەلاتم
بە گازی خەردەلی خوێنخواری مزدوور
مەڵێن بۆچی وەهای کرد کوێلە؟ ئەرباب
ئەوەی لێ ویستووە، مەجبوورە، مەجبوور
غولامی ئەجنەبی، عەبدی ستەمگەر
ئەبێ بڕوا بەپێی فەرمان و دەستوور
شەرەف کوا، دینی چی، ئەخلاق لەکوێیە
ئەوی وا خۆی فرۆشت سەرمەستە، مەخموور
بەڵام وای لەو دەمەی بای خەمڕەوێن بێ
پڵنگ دەرچن لە لانە، توورە، پڕ شوور
بەکوێدا دەرئەچێ، (هێژا)، ستەمگەر
بەدادیا کەی ئەگەن خاقان و فەغفوور

(١) کۆس و کۆلارا و بەتەواوی مەراسیمی تەعزیەی قەدیم وێژراوە. (٢) قەلاخی: واتە سەرتاپا ڕەشپۆش.

## شینی گەرم

پەڕ و باڵم پڕوزاوە، دەخیلە ئەی ڕەفیقانم
دەمێ گوێ ڕاگرن بۆ شینی گەرم و سۆزی گریانم
چرۆی باغی هیوام یەکجاری «دامردۆ»[1]، خودا چی بکەم
نەمامی موڵکی خۆشبەختیم «لەبن کەوت»[2]ماڵی وێرانم
درەختی سەر «دیبارگە»ی[3]، ئارەزووم و خەڵفی ئاواتم
خەزانی کرد و هەڵقرچا چرۆ و «خامە»ی[4] تەڕو جوانم
مەگەر دێنۆ جەوانانی «هەڵەبجە» و لاوی «مۆردانە»ی
لە «چوارباغان» «جلیت بازی» ئەکەن گەنجانی «جافانم» ؟
لە سەیرانی «عەواوەیلی» لە «باوەکۆچەک»ن یاخۆ
لە کارێزی «عەنەب» کۆبوونەتۆ یارانی جارانم؟
لە گوڵگەشتی «گولان»ن یا لە باغی «میر» و کارێزی
لە «کانی قووڵکە» کۆن یاران وە یا لای کۆشکەکەی «خانم»
دەمێکە دەنگی دەرنایێ دوو تەپڵەی هەی سوار هەی سوار
لە ڕمبازین مەگەر تیپی جەوان و شۆڕە سوارانم
دە توخودا «هۆرەچڕ»[5] هەی سوارە سوارەم بۆ بڵێ تا من
لە «ڕۆنیاس»ی خومی ئەشک هەڵبکێشم چاکی دامانم
بەخوێناوی دڵ و جەرگم گوڵی کەم بەرگی زاری و شین
دە توخوا خەڵکە لێم مەگرن بریندار و پەرێشانم
«کەوەی کاسەسم»و «ڕەشکویت»و «سەگڵاوی» یەدەک کەن جا
بەگەل خاتوونی خێڵان، ڕۆڵەڕۆ کەن بۆ جەوانانم
نەوای وەی من منی ئافرەت بگاتە عەرش و بیبیسن
فریشتان بێنە ناو کۆڕی نەوای پڕ سۆزی ئەفغانم
ئەوانیش قوڕ بپێون، سینە لێدەن، بانگی بۆ هەڵدەن
«چەمەر» لێدەن، «بلاوێن»[6]، بێن، بلاوێننۆ شەهیدانم



دەسا «ئاڵایی و کۆتەڵ» بەرێکەن، خومگەران بێنن
لە خوم دەن لەچک و فەقیانەی کوڕی ئاغە و کچی خانم
لەکوێ قەوماوە پێشهاتێ جیگەر تاوێن بێ بەو ڕادە
بە چی بێم پڕکەمۆ شوێنی جەوانمەردان و لاوانم
فەلەک چەرخت شکێ بۆ وا هەمیشە چەوت و چەپگەردی
عیلاجێ، چارەیێ، کوانێ، چ بێ تیمار و دەرمانم؟
لەسەر سینگی زەمان پێویستە شەقڵی کەن بە ژاری مار
بنووسن ئەم جینایاتە کە بێ وێنەش بەویجدانم
کە بیخوێنێ ئەوی «هێژا»یە هەڵگرسێ هەتا تایە
بچێتە ڕیزی یارانی خەباتکار و بەئیمانم

(١) دامردنەوە: پەژموردەبوون و سیسیانی نەبات. (٢) لەبن کەوتن: وشکبوون و تیاچوونی درەخت. (٣) دیبارگە: ئاسۆ. (٤) خامە: توولی نەرم. (٥) هۆرەچڕ: هۆرەوێژ. (٦) بلاوێن: دەنگخۆشی تەعزییە کە مردوو ئەلاوێنێتۆ.

## مەرۆ شیرین

مەرۆ، شیرین! کە چوونتم پێ گرانە
بە بێ تۆ ئەم بەهارەم لا خەزانە
مەرۆ ئاهەنگی دڵداری ئەگێڕن
سبەینێ بەزمی گەرمی خومگەرانە[1]
مەی و مینایی ساقی و بەزمی موطریب
هەموو بۆ دڵنەواییی، بێ دڵانە
نەی و سەمتوور و سێ تار و قەتارە
پەری پەیکەر[2]، نەوازەندەی[3] کەمانە
خەدەنگ[4] و تیری دڵدۆز، پەیکی دڵپێک[5]
لە پێکانی دڵی دڵ خەستەگانە
مەزاتی نەوجەوانان گەرم و داغە
ئەوین مایەی مەتای سەوداگەرانە
سەمەی[6] بەزم و سەمان سالار و سەروەر
لە هەرکوێ زەمزەمەی سەوداسەرانە
لەوێ ڕەند و ئەمیر و خان و سەردار
کە سەرمەستی ئەدای خۆشخەندەرانە[7]
گوڵستانم خەزانی دوور لە تۆ بم
لەگەڵ تۆم خەیمەگا باغی جینانە
لە عەرزی خاکییا کەی وەقرە ئەگرم
شەقامی کامەرانیم کاکەشانە
یەقین سالاری تەختی سەرفەرازیم[8]
بەهەشتی موڵکی هەستیم جاویدانە[9]
لەوەولا چیم ئەوێ کاتێ کە تۆم بێ
چ خۆشبەختم هەوای[10] تۆم ئاشیانە



لە ئەروام ئەر بپرسی حاڵی چۆنە
مەحاڵە بۆت بەیان کا بەم زمانە
غەزیز! زاراوی دڵ مەر خۆی بزانی
خۆلاصەی عیشقە، شەرحی زۆر گرانە
دەخیلە بێ تۆ لەم گوڵزارە زارم
لەدەس ئەم چوونتە غەوغام بێ ئەمانە
کە (هێژا) ڕیشی هێنا حاجەتت چۆن
ڕەوایە تەرکی کەی، بارێ گرانە

---

(١) خومگەر: مەی دروستکەر. (٢) پەری پەیکەر: پەری ئەندام و بەدەن. (٣) نەوازەندە: موطریب.
(٤) خەدەنگ: چێوی تیر. (٥) ئیشارەی دڵپێک لەلایەن مەحبووبەوە. (٦) سەمە: پەرت و حەیران.
(٧) خۆشخەندەران: بەدەماغ و لەسەرحاڵ. (٨) سەرفەراز: سەربوڵەند. (٩) جاویدان: ئەبەدی. (١٠) هەوای تۆم ئاشیانە: عیشقی تۆ هێلانەی ئاسایشی منە.

## زیندووی عیشق

وەرگێڕاوی غەزەلێکی حافظی شیرازییە

ساقی! بە تیشکی بادە چ ڕووناکە جامی مە
خۆشخوێن! لە گەردشایە زەمانە بە کامی مە
ئێمە لە جامی مەیا سەیری ڕوویی یار ئەکەین
ئەی بێ خەبەر! لە نۆشی سبەینان و شامی مە
نامرێ دڵێ بە عیشقی خودایی تەکان ئەدا
چون قەیدی قەزاتانە لە گێتی دەوامی مە
هەر ناز و ئەدای ڕەعناقامەتان پەسەندە تا
خۆی بێتە دەر لە پشتی پەردە خۆشخەرامی مە
ئەی بایێ بە گوڵزاری نیگارا گوزەر ئەکەی
نامەردە پێشکەش بە ڕۆحی من کەی پەیامی مە
بێژە کە ناوی ئێمە لە دەسقەس لەیاد نەچێ
خۆی وایە ئەبێ نەپوێ، لەناوا بێ نامی مە
سەرخۆش بە شاهیدی دووچاو خوماری دەسخەڕە
بۆیە سپێردراوە بەمەستی زەمامی مە
ترسام کە ڕۆژی باسوخواس نەگاتە بارەیێ
نانی حەڵاڵی شێخی، لە ئاوی حەرامی مە
(حافظ) لە ئەشکی دیدە بڕێژە دانەی ئاودار
بەشکەم پەرەندەی (هێژا) کەوێتە ناو دامی مە



## بۆنی یار

وەرگێڕاوی غەزەلێکی بەهەشتی حافظی شیرازییە

بۆی خۆشی ئێوەی هەر کەس سەحەر لەبای صەبا بیست
نەوایی ئاشنایی، لە دەنگی ئاشنا بیست
سەروەری ئێسک سووکان! سەیرێکی هەژاریش کە
ئەم گوێمە داستانی زۆری شاه و گەدا بیست
بە بادەی میسک سانێ حەقیە دەماخ چاخ بکا
چون زۆری لە دەیرنشین بۆنی مەکر و ڕیا بیست
قەت سیڕڕی خودای صۆفی ڕێڕەو بەهیچ کەس نەوت
سەرم سڕما مەیفرۆش هەمووی لە کام نەوا بیست
ئیلاهی کوا ڕازدارێ بەڵکو لە فرسەتێکا
دڵم بۆی هەڵبڕێژێ، چیی وت و چیی لەولا بیست
کەی پێ شیاو بوو دڵەی ڕازدار و حەق شناسم
لە خەم ڕەوێنی تانەی بەتاڵ و ناڕەوا بیست
لە جەرگەی یاران ئەگەر دەرکرێم چی قەوماوە
لەم گوڵگەشتی زەمانە، لە کوێت بۆیی وەفا بیست
نە تەنیا ئێمە ئەمڕۆ مەینۆشی خەرقە پۆشین
پیری مەیخانە صەدهای لەم جۆرە ماجەرا بیست
نە هەر ئێمەین بەتەنیا بە بانگی چەنگۆ مەستین
هێندە دەورکرایەوە نەوای چەرخی سەما بیست
فەقەت مۆچیاری[1] پیشەی ئێوەی (هێژا)یە (حافظ)
دەربەس مەبن کێ نەیبیست یا پەندی بێ ڕیا بیست

(١) مۆچیاری: نەصیحەت.

## خۆم و بەختم

لە کاروانی وەفایا خۆم و بەختم قافڵە سالارم
لە جوملەی دڵبراوانی قەبووڵم کا فیداکارم
غەمی سەودای فیراقیشی بە دڵ هەموار ئەکەم چونکە
بەدەم دەردۆ ئەگەر ناڵەم دەرێ دیسان خەتابارم
سەحەر چەپکەی کلاڤەی مووی کەبەر سروەی نەسیمدا و چو
نەوا و ئاهەنگی «ئەی دڵ ئەی دڵ»ی هەستان لە گوڵزارم
لەبەر بۆی میسکی گیسووی تاقمی شەیدا لەسەرخۆ چوون
منی بێ چارە گیانسەختم، کە تا ئێستاکە بێدارم
هەزاران بێ دڵی زاری حەواڵەی گۆشەیی خوم کرد
بە سەدها ئەلف قەددی ناردە خەمخانەی غەمی یارم
جەفای طەننازی نازی عیشوە دارانی خۆماری مەی
دەوای دەردی دڵی بیمارە تا زیندووم تەمادارم
دەترسێم لای وەها بێ چاوی باز و چەرخی[1] خونکاری
منی گیانباز لە مەیدان دەرئەکا، ئاسان لە پەیکاری
لە ڕۆژی خیلقەتا باری ئەوینیان دا بەسەر خەڵکا
مەی و مەستیم تەڵەب کرد، تا بە دڵ بینێمە سەربارم
عەزیزم! من قوتابیی مەکتەبی عیشقم بە سەربەستی
دەڵێم (هێژام) دە با مەی بێ پەیایەی ساقی بیمارم

(١) چەرخ: مەلیکە زۆر تیژباڵ، بەڵام لەباز چکوولەترە، وە شکارچییەکی ناقۆڵایە.



## باغەوان

زانیوتە باغەوان کە سبەینان گوڵی چەمەن
دەشنێنەوە بۆ؟ تاکو دەمی غونچە وا بکەن
بۆ سۆزی قومرییە ڕازانی خامە ئەرغەوان
مەحشەر دەکەن هەراڵەیی نەسرین و نەستەرەن
ڕەشهەڵگەڕاوی ئاهی کەناری دڵ و دەروون
شەقایقی[1] ڕەنگ ئاڵی لاشەتاو و سەرخەرەن[2]
ناز و ئەدایە لە گوڵگەشت و ساز و سۆزی دڵ
بۆ شینی بولبولە ئەدڕێنێ غونچە تۆڕی تەن[3]
ئەو ناڵە ناڵ و شۆرە لە گوڵزاری ژینەدا
بێ عوزر و بێ بەهانە، کە ناجۆرە پیاوی ڕەن
سەرجەم ئەوانە بێرە بسێنەن[4] بە بێ گومان
سەوداگەرانی هەردەسە جنسێ پەسەن ئەکەن
کارزانی بازیگەریش بازی بەرئەدا لەکوێ
دای دایە سەر شکاری ئەنازی بە کاری فەن
هەر وا دەبێت و وا بووە یاسای موعامەلە
دەستێ جەفایی درۆ و یەک دەستە گوڵ دەبەن
ئاسان نییە سەودا چ لە بازاڕی گێتییا
سەوداگەرانی کۆن و دەڵاڵی بەتەجرەبەن
بازی شکاریی و صەییادی ماهیرن لەوێ
ئاسان دەپێکن و سەر چاک ئەکەن لە تەن
(هێژا) ئەگەر حەقیقەت و ڕاستی بووێ ئەوان
ڕێندانە تیر ئەهاون و جانانە لێ دەدەن

(١) شەقایق: گوڵاڵەسوورە. (٢)سەرخەرە: سەر توختان، سەر تەلان، سەر سەکۆ. (٣) تۆڕی تەن: بەرگی نازکی سەوزی دەوری غونچە، کە پشکا ئەدڕێ. (٤) بێرە بسێنە: دان و وەرگرتن. کڕین و فرۆشتن.

## دێر یا زوو

له چاوکەی چاومەوە خوێناو ئەجۆشێ
دەمەی غەم تیشکی هیوام دائەپۆشێ
ئەوەندەم کۆسی نابار کەوت لەسەریەک
نە سەبرم ما ، نە فامم ما ، نە هۆشێ
لەباتیی ئاوی چاوکەی ڕوونی کوێستان
گولاڵەم شیرەیی حەسرەت ئەنۆشێ
هەتا بۆی بکرێ غەدداری ستەمگەر
بە فیزۆ شیرەیی گیانم ئەنۆشێ
لەگەڵ دەنگێ دەرێ، هاوارێ هەڵسێ
تەرەس بەرگی غەزەب بۆ شەڕ ئەپۆشی
بە سەد نەیرەنگ و فێڵ و مەکر و ئەتوار
هەرا و هاواری هۆزم دائەپۆشێ
بە ئەفسوونی هەزار ڕەنگ دێتە کایە
بە زۆر و ماڵ و زەڕ بۆم تێدەکۆشێ
هەتا زووتر کپم کاتۆ و نەزانرێ
لەبەینایە هەرا و جۆش و خرۆشێ
بەڵام ئەو کاسە زەهرەی هۆزی ئێمە
کە لێی ترساوە دێر یا زوو ئەنۆشێ
خەریکی ڕاپەڕینە قەومی (هێژا)
پەکی ناخا تەقالای شەڕفرۆشێ



## له شەو بێدار بپرسە

مەکەن لۆمەی ئەوی مەست و خەرابە
جیگەر بوریان، دڵی داغە و کەبابە
لە بازاڕی کەسادی شۆری مەستا
تەن و گیان، قیمەتی جامێ شەرابە
لە خومخانەی هەوادا لانە بگرە
وەفادار و فیدایی و بێ ڕییا بە
بە یادی نەرگسی شەهلای خومار و
بەرەو مەیخانە چوون بێ شک سەوابە
نەکو دووربانێ یار زیز بێ و بڕەنجێ
لەکوێ هەموار ئەکرێ ئەو عیتابە
لە شەو بێدار بپرسە دەردی دووری
شەوی هیجرەت درێژ و پڕ عەزابە
شەوێ غەم باڵی ڕاکێشێ بەسەرتا
ئیتر ئارام و ئاسایش سەرابە
سکاڵای ڕۆحی هەردەی عاشقی زار
غەم ئاوای هەردەڵێی ناڵەی ڕەبابە
دڵی گۆشتین و پڕ پشکۆی فیراقی
گەلێ ڕەنجێکی قورس و ناحیسابە
لە تۆری فەرزە ترس و بیم و پارێز
دەخیل خۆت لادە (هێژا)! پیاوی چا بە

## نامۆ: وەحشی

تیشکی هەتاوی سەر کەلە پرشنگی ڕوومەتی
خەرمانی مانگە چێرەیی، ئالآیە قامەتی
زاخاوی چاوو دیدەیی لێلآوە دیمەنی
ماتن پەری، لەشێوەی، دڵخواز و شەوکەتی
گەل گەل، فریشتە دێ کە لەدەوری سەری گەڕێ
بۆی بۆ پڕووزە، لە خەرمانی تاوی، طەلعەتی
گوڵباغ و لالە لەکوێ و، ئاو و ڕەنگی ئەو لەکوێ
لەعلن دو لێوی، سێوە دوو کوڵمی قیامەتی
نامۆیە دڵ، کەوازرە، شاهێنی تێمەکەن
ڕاوچی حەزی لە خوێنە، چ دەربەس شەل و پەتی
مەنعی چلۆن دەکەی ئەو بازە بازە، ڕاو ئەکا
ئازادەیی سەودا، بە مەیی نابە، عادەتی
مەر دڵ بزانێ چ غەددار و فرزە دلبەری
ڕازێکە گرفتاری دەزانێ، بە قودرەتی
سەرخۆش و مەس نەبێ نابێ لەدووی بچێ کەسێ
هەموار کە موشکیلە بۆ هەرکە سام و هەیبەتی
(هێژا)یە ئەوەی سەیری ئەکا و ماوە لەسەرخۆ
شەهبازی شکاری دڵە، شاکارە هەڵمەتی



## گەرمەڕۆی کاروون

عەزیزم! خۆ بەخۆ مەجنوون نەبووم خۆ
هەتاکو تۆم نەدی، مەفتوون نەبووم خۆ
کە من کەمتەرخەمی و دووریم نەدیبوو
پەرێشان خاتر و مەحزوون نەبووم خۆ
بە شوێنی عیشقی تۆدا ون نەبووبام
دەرەندووی گەرمەڕۆی[1] «کاروون» نەبووم خۆ
ئەبێ بۆ ئەشکی ئاڵم شۆڕ و خوڕ بێ
کە لافاوی چەمی جەیحوون نەبووم خۆ
مەدە تانە لەوەی «کەڵپۆس» لە پێڵم[2]
لەمەوپێش وێڵ و تووناوتوون نەبووم خۆ
لەبەرتۆ مەینەتی ژینم ئەکێشا
وەگەرنە قەت لەمان مەمنوون نەبووم خۆ
نیگارا! خۆ دەسە و دۆعا کە وەستام
تەماداری سزای بێچوون نەبووم خۆ
پەنام بۆ کێ بەردایێ لەوەولا
لەتۆ و لا دەسخەڕەی گەردوون نەبووم خۆ
لە سەودای عیشقەدا (هێژا) خەرابە
ئەگەرنا دەربەسی تیاچوون نەبووم خۆ

---

(١) گەرمەڕۆ: گەرمەسێر. (٢) کەڵپۆس لەپێڵ: فەروەلەبەر.

## میری مەیکەدە

وەرە ساقی! بە سەرگەردی دەس و پەنجە و پییاڵەت بم
بە دڵ حەیرانی بێ پەروای، قەد و باڵا و گراڵەت[1] بم
شەهیدی تێغی خوێنڕێژ و دەبانی شیری ئەبرۆ بم
لە گۆمی خوێنی خۆم گەوزاو و ڕەژیاو و شەلاڵەت بم
مەگەر من ڕوو لە خوێن دەم[2] تا وەکو ئەو کوڵمە ڕەنگین بم
ئەگەر وا دەرنەهات، مەعلوومە، نەکراوە خەجاڵەت بم
کە من مەستی هەوام، کەی باوە[3] ئارام و لەسەرخۆ بم
ئەبێ مەدهۆش و بەدمەست و سەراسیمە حەواڵەت بم
لە باغی حوسنی خەڵقا، چی بڵێم، بەو جۆرە خوڵقاوی
منی حەیران تەماشاچیی، هومای ئیقباڵ[4] و تاڵەت[5] بم
وەکو شێعە دەبێ بۆ مۆری[6] بەرسەجدەم لە مزگەوتا
هەمیشە سەر لە بەر تاقی برۆو ئەو ڕێزە خاڵەت[7] بم
ئەگەر تۆرا دڵەی شەیدام لە دەستی ناز و ئەتوارت
ئەبێ گەوهەرفشان، شیرین[8] زمان، پەیکی دەلالەت[9]بم
مەگەر هەروەک جەواهیر سەنجی[10]سەردەرچوو لەجێی یاقووت
لە بازاڕ موشتەریی لەعلی لەب و ئەو کوڵمە ئاڵەت بم
ئەگەرچی من جەوانمەرد و ئەمیری مەیکەدە و «هێژا»م
لە خومخانەی ئەوین، فەخرە کوتی شەربەی سووالەت[11] بم

(١) گراڵە: تاپۆ، ڕێخت. (٢) ڕوو لەخوێن دەم: ڕووم لەخوێن هەڵژەنم. وەکو ئەڵێن چارەکەکەم لە خوم دەم: واتە لەخوم هەڵکێشم. (٣) باو: ڕەسم و عادەت (٤) هومای ئیقباڵ: بازی ئیقباڵ و بەخت، لە کۆنا ڕەسم بووە بۆ تایین کردنی پادشای تازە لەجێی پێشوو بازیان بەرداوە، بەسەر هەر کەسێکەوە نیشتبێتەوە کردوویانە بەپاشا. جا بەو جۆرە بازە وێژراوە «هومای ئیقباڵ» واتە بازی بەخت. (٥) تاڵە: بەخت ئەو وشەیە بەکوردی کراوی وشەی «طالع»ە واتە بەخت. (٦) بەردە مۆرە: بەو بەردە ئەڵێن کە شیعە ئەینێنە بەر سوجدەکەیان تاکو سەجدەگاکەیان سفت بێ. (٧) ڕێزە خاڵ: بە خاڵی وردی چیرەی وشەویست و تراوە. (٨) گەوهەرفشانی: واتە گەوهەر هەڵڕژاندن، کنایەیە لەقسەی جوان کردن. (٩)





دەلالەت: نازدان و دڵخۆشی دانەوەی کەسێ کە زیز بووە. (١٠) جەواهێر سەنج: جەواهێر تاقیکردنەوە و جەواهیر ناسین. (١١) باو بووە لە مەیخانانا زیاتر لە شەربەی سووالەتا: واتە لە شەربەی خاکی سوورۆکراوا مەی خووراوەتەوە، ئەڵێ ئەگەر کوتی شەربەی سووالەتی بەری مەیخانە بم فەخری پێ ئەکەم. جا مەیخانە لە ئیستیلاحی عارفاندا واتە موحەببەت خانە. یانێ تەکیە و جێی ڕاز و نیاز. تا تۆ مەرامت کامیان بێ.

## خاڵ خاڵ

موتاڵای ڕێزەکاریی کردگار[١] کەی سەهل وا ئاسانە
ئەوی لەو فەننەدا پێی وایە زۆر ئوستادە، نادانە
بە چی تەشبیە ئەکا ئەو قامەتە مەوزوونە[٢] بێ عەیبە
ئەڵێ وەک سەروی ئازادە لەکوێ ئەو سەروە و جوانە
ئەکەن تەشبیهی کوڵمی نازکی سووری بە سێو یاخۆ
ئەڵێن لێوی ئەڵێی لەعلی «خەجستان» [٣] و «بەدەخشان»ە[٤]
وەیا چاوی ئەڵێی ئەستێرەیی ئاسۆیە ئەدرەوشێ
بەڵام پەروین[٥] و ئەستێرەی بەیان کەی وا درەخشانە
ئەڵێن ڕەوتی تەزەرو[٦] ئاسایە لەنجەولارەو و عیشوەی
خەیاڵ ئەنگێز[٧] ئەڵێی بۆ جووت لە خاڵخاڵا[٨] خەرامانە
ئەڵێن سووریی سەری کوڵمی نموونەی ئاوری عیشقە
وەیا ئاوڕەنگی هێند ئاڵە چمان خوێنی شەهیدانە
ئەڵێن حەڵقەی کلافی موویی میسک و عەنبەر و عەطرە
لەکوێ چەپکەی گوڵ و سونبول وەها بێنخۆش و فەتتانە[٩]
تەزەروی خۆشخەرام[١٠]ی من لە خاڵخاڵی خەیاڵمدا
چ بێ ویجدانییە بێژن ئەڵێی طاووسی ڕیضوانە
نیگاری سەرهەواران و بوتی ڕەعنای ئەوینی من
لە وێنەی کوا پەری فامە، لە خێڵی میری بابانە
ئەڵێن (هێژا) دڵی پێداوە، گیانیشی بوێ ئەیدا
ئەڵێم عاشق کە ڕاساڵ بێ، ئەوی لای هیچ بەبێ گیانە

(١) کردگار: خالّق، خوا. (٢) مەوزوون: ڕێکوپێک. (٤،٣) خەجستان و بەدەخشان: ناوی دوو شارن کانی لەعلیان بەناوبانگە. (٥) پەروین: ئەستێرەی هێشوو. (٦) تەزەرو: مریشک و کەرەشێڵی جەنگەلی کە ڕەوتیان زۆر جوانە. (٧) خەیاڵ ئەنگێز: خەیاڵ هەڵخڕین، ئیلهام بەخش. (٨) خاڵخاڵ: ناوچەیەکی ئازربایجانی ئێرانە کە لکاوە بە جەنگەلەکانی ناوچەی تالشنەوە و مریشک و کەرەشێڵی جەنگەڵیی زۆرە. (٩) فەتتان: فیتنە ئەنگێز، فریبەندە. (١٠) خۆشخەرام: خۆشڕەوت.



## بێ تۆ

دڵم تەنگ و تەنم بیمارە بێ تۆ
حەواسم پەرت و ڕۆح بێزارە بێ تۆ
هەراسان و مەلوول و دەردەدارم
دەروونم زام و، بێ تیمارە بێ تۆ
بەجێ ماوم لە کاروان، کەوتە کارم
لەتۆ بێ بەهرە، بارم لارە بێ تۆ
لە چاوم ئەشکی سوور و خوڕ ڕەوانە
چمان سەیلی جەم و ڕووبارە بێ تۆ
لە دڵما سووسەیی هیوا بڕاوە
ژیانم ژان و ناهەموارە بێ تۆ
وەڵاتی موڵکی دڵ خاپوورە خاپوور
بە ڕاس بێ یار و بێ غەمخوارە بێ تۆ
عیلاجی دەردی کاریم زۆر گرانە
شەوم شێواو و ڕۆژم تارە بێ تۆ
پەرێشان خاتری سەودای ئەوینە
غەریبی ئاوەدانی و شارە بێ تۆ
لەکوێ ئارامی بێ و چۆن دامرکێ
شەو و ڕۆژ کاری هاوار یارە بێ تۆ
وەکوو فەرهاد لە کێوی بێستوونت
لە ڕەنجی بێ وەری و بێ بارە بێ تۆ
ئەڵێی گیانە (بەهێژا) چارە چاکە
ئەڵێم چاری چییە بێ چارە بێ تۆ

## تەلانە

تەلانەم[١] بردە بەر ماڵی چەم و خەم[٢]
نەمامێ هاتە بەر قاپی بەئەستەم
دەری لێم کردەوە بووکێ بەنازۆ
دەتاویاوە لە شەرما هەروەکو شەم
تەزی دیداری جوانی و بەرقی دیدەی
دڵی لەرزانمەوە و دامنا تەلانەم
سەلامم کرد و پێم وت ئەی کچی چاک
خەم هەروا نیشتەجێن لێرە لەگەڵ چەم
بزەی گرت و سەری داخست لە شەرما
وتی: خەم ئاشنا و شەم[٣] چوون بەرەو چەم
دەیانویست بچنە گوێی کانی و سەراوێ
چەم و خەم کەن، بەجووتە دوور لە عالەم
وتم باشە بەقوربان سەیری باڵات
موجازە بۆ دڵی داماوی خەستەم
وتی زانیم زەدە و زاماری بۆیە
حەزم کرد دەرکی ئولفەت ئاوەڵا کەم
وتم مادام کە وایە سەروی ئازاد!
دە بێ پەردە لەسەر ئەو ڕازە لادەم
دەمێکە شێت و شەیدا و دڵ لەلاتم
پەرێشان حاڵم و هەردە و چەواشەم[٤]
ئەگەر تا ئێستە خۆم گرت، لێت دەترسام
بەلاتۆ وانەبێ پێکراوێ تازەم
لە ڕۆژێکۆ کە چرپاندت بەلاما
بە سواریی ئەسپی ئاهووسانی[٥] «ئەدهەم»[٦]



وەک شاهێن[٧] دڵی شەیدات ڕفاندم
بە شوێن تۆم، ناتگەمێ، سەڵتە[٨] و پیادەم
ئەگەرچی هەوڵی زۆرم دا بەدووتا
منی پێ خستووی لەنگ دیارە ناگەم
بە ڕۆح و گیان و دڵ شەیدا بەشوێن تۆ
کە بەشکەم خۆت پڕی کەی جامی بادەم
بەئاوات بووم کە ئیزنم دەی سەر ئەنجام
لە کۆی[٩] سەودای خەما خێوەت بەپاکەم
لە (هێژا) ناوەشێتۆ بێ ئەدەب بێ
نەزاکەتبارە سۆزی داغی[١٠] سادەم

---

(١) تەلانە: خۆراک، شتومەکێکە کە لەسەر حەفتەدا ئەیبەن بۆ بووک لە باوانەوە، جا ئەڵێن تووشە و تەلانەیان برد بۆ بووک. (٢) چەم و خەم: ئەتوانێ ناوی دوو کچ بێ وە هەروەهاش بەدەم باسی عغەرام و عیشق ئەوترێ. (٣) شەم: ناوە، وەکورتکراوەی شەمعە واتە مۆم. (٤) چەواشە: سەرگەردان سەرلێشێواو. (٥) ئاهووسان: ئاسک وێنە. (٦) ئەدهەم: ئەسپی ڕەشکوێت. (٧) شاهێن: نەوعێکە لە هەڵۆ. (٨) سەڵتە: پیادە. (٩) کۆ: گەرەک. (١٠) خوازبێنیی بەئەدەبی خوشکی، خوازبێنیی خەم لە چەم.

## قوو

لەتاو شمقارِی[1] شوومی نەفسی جادووم
گەلێ بێزار و خەستە و مات و ماندووم
لە گۆلی مەند و ئاوی صاف و ڕوونا
دڵ ئارا بوو سەمای ئەفسانەیی قووم[2]
لەپڕ هاژە و شەقەی شاباڵی شمقارِ
شکاندی شاپەڕی ئەفکاری زیندووم
کە قازم پۆلی شێواو، باڵی گرتۆ
پەکی کەوت زیرەکی و، مات مام و تیاچووم
ئەبێ بۆ چ وەی[3] لەمل بێ وەی بئاڵێ
سزا بدرێم لەپێی ئاسایشی زووم
چ مەینەتبارە بێ تاوان بچێژێ
عەزابی بێ جیهەت بەختی خەواڵووم
گرانە لام کە زانا و هۆشمەندان
لەلایان وابێ من بێ حاڵ و خەوتووم
ڕەوایە جارِ بدەم تا دەنگم ئەڕوا
بەجێیە بیر و هۆش و زۆری بازووم
لە خۆڕا تێک نەدەن کۆشک و کەلێنم
حەرامە هەڵتەکێنن دار و پردووم
کەڕن وا ناژنەون ئاهەنگی گیرام
تەرانەی ژین ئەخوێنێ مورغی یاهووم
بوڵەند و پایە بەرزە ڕۆحی بێدار
بەکارە هەروەکوو زوو شان و باهووم
لەکوێ دەربەس چەرەند و دەنگوباسی
قسەی پووچی، یەکێ دوو یاری بەدخووم



بە جێ ناگا دەم و دووی کوێر و هەرزە
بە ئاسان قالب و پڕ پێستی هەردووم
دەمێکە خۆم ئەپارێزم، لە نادان
بەڕاستی لەو قەبیلە خەڵکە ماندووم
ئەگەرچی هەرزە، دانم لێ ئەساوێ[4]
بەڵام (هێژا)م، بوڵەندە بورج و بارووم

(١) شمقارِ: مەلێکی ڕاوچیی قەوییە کە بەڵای گیانی قازە. (٢) قوو: کرماشانی، بێچاڕی، فارس بەگشتی بە قاز ئەڵێن. (٣) وەی: بەڵا، موصیبەت. (٤) دانم لێ ئەساوێ: ئیستیلاحە یەعنی هەڕەشەم لێ ئەکا.

## گەڕەکی خەراباتییان

وەرگێڕراوی غەزەلێکی مەولانا جلال الدینی ڕۆمی (دیوانی شەمسی تەبریزی)یە

مەکۆی خەراباتی عیشق، ئەر بزانی لەکوێیە
کەعبەت لەبیر ئەچێتۆ، قیبلەت لا جێبەجێیە
لە کەعبە کوانێ خەبەر، لە قیبلە کوانێ ئەثەر
لە هەردوو کوا تێپەڕی، ڕووت لەغەیری خۆی کێیە؟
ساقی کە ڕۆژی ئەزەل، شەرابی ئەلەستی دا
مەستی لەسەر مەخموورا تا ئەبەد هەر خدێیە
ئێمە بە مەی مەس دەبین، سەرخۆشی مەی بەخۆیە
کاتێ کە گشتی خۆیە، چۆن و بۆ کێ بەکێیە
با بەس بێ پاڕانەوە، ڕووە و خەرابات بڕۆ
بڕوا، پیری خەرابات، پەیامی شادیی پێیە
ئەگەر بە ڕاس عاشقی، لە لاڵە و پارە گەڕێ
چونکە ئەو بەزم و باوە، ڕییا و تەزویری لێیە
لەگەڵ خەراباتییان، کە پان و پۆڕە ڕێیان
زوو بە مەنزڵی موراد ئەگەی چون ڕاستەڕێیە
چۆن بەلاتۆ خامۆشە، کوورەی خەرابات نشین
کاتێ تەواو تەپ و دووت هەر هیی خەڵکی ئەوێیە
شانازی تەورێزییان، شەمسی (هێژا)ی دین یەقین
لەگشت تاوانێ بەری و، دوور لە ئەرێ و نەرێیە



## چەرخی چەپخوون

دڵم کەیلی جەفای گەردوونی دوونە
کە یار و یاوەری جەردە و چەتوونە
ئەوی ئازادەو و وریا و دلێرە
دوچاری گەوج و گیرۆدەی جەبوونە
دڵم هەمواری ناکا سەیر ئەکەم وا
ئەوی جوامێرە، بازیچە و زەبوونە
دەمێکە ئەم مەبەستەم پێ گرانە
گلاراوی[1] دڵ و ڕۆح و دەروونە
هەتا کەی چەپ دەسووڕێ چەرخی چەپخوون
هەتاکەی بەختی دانا سەرنگوونە
فەلەک تا کەی «زەلانی»[2] ناخەوێنێ
«شەماڵ» بۆ نایێ هەر سۆزەی «سەبوون»ە[3]
دەمێکە ڕۆژگار مەینەت بەکۆڵە
مەتای نابابی، سەرباری فسوونە[4]
بەداخۆ ژیر و پیر، کارزان و وریا
کەنارە و، گەوج و لاڕێ ڕێنموونە
کە من پێم وایە بورجی کەوکەبەی خەم
لە ڕووخانایە، قالۆرەی هەسوونە[5]
وەرن یارانی زانا ئێستە مەتڵەب
لەسەر تیاچوونە، یا بوون و نەبوونە
گەلێ تەنگە مەساف[6] بۆ بیر و تەگبیر
تەکان پێویستە چار، بێ چەند و چوونە
لە ڕادەی پڕ مەترسیدا پەکت کەوت
سەر ئەنجامت، پەشیمانی و نەبوونە

عیلاج و چارە پێش قەومان بەجێیە
بڵێی خۆش هات ئەوی پێش هات، جنوونە[٧]
مەڵێ (هێژا) لەجووج و توند و تیژە
لە حەسرەتدا، گەرووی گیراوو توونە

(١) گلاراو: بێ ئارام، وەقرە لێ بڕان، موضطەریب. (٢) زەلان: بای وشکە زوقمی زەبەندی پایزی سارد. (٣) بای گەرمی هاوینی مەسمووم: کە زۆرجار خەڵک ئەکوژێ. عەرەب «سموم»ی پێ ئەڵێن، وە بای تایبەتی ناوچە گەرمەسێرەکانە. (٤) فسوون: فێڵ و کەلەک: فریبدان. (٥) هەسوون: کۆڵەکەی ناوەڕاستی دەوارە، پێم وایە ڕیشەکەی لەگەڵ «ستوون»ی فارسییا کە بە مەعنای بایە وە کۆڵەکەیش بەکارئەبرێ، یەکێ بێ. (٦) مەساف: مەیدان، فورسەت، ماوە. (٧) ئەوی پێش هات خۆش هات: مەتەڵێکی کوردییە لەبارەی ئەوانەوە ئەوترێ کە بێ ئیرادە تەسلیمی پێشهاتن.



## جەوری فەلەک

فەلەک شەڵتاخی[١] پێ کردم، براکەم
لە جەننەت کەی نیازم وا بوو ڕا کەم
لەکوێ من لێ بڕام تەرکی وەتەن کەم
لەگەڵ عەشقی خوداییدا جەفا کەم
دڵم کەی پێوە بوو کەوسەر سەراوێ
لە سەر دەرکەم، لە دۆزەخ جێگە چا کەم
خەیاڵم کوا بوو گوڵزاری وەلاتم
بەجێ بێڵم لە صەحرادا سەرا کەم
لە گوڵگەشتی وەڵات و سەرسەراوی
ببوورم لای سەراب خێوەت بەپاکەم
لەگەڵ پەنجەی قەدەر چۆن پەنجە لێ دەم
یەخەی گرتم، لە چی چوون و چرا کەم؟
لەگەڵ کلکی قەڵەم چی بکەم کە نەشکا
حەزم لێ بوو، کە پەنجۆڵەی دووتاکەم[٢]
بەڵام نەکرا، فەلەک وا کۆڵی پێ دام
لە مشتومڕ[٣] هەتا بکرێ حەشا کەم
خەیاڵی کوردەواری دێ بەسەرما
دڵم وا پێوە باڵ و پەڕ پەیا کەم
لە شەقەی باڵ بدەم تا بەندی شاهۆ[٤]
بە سروەی سەر هەوار دەردم دەوا کەم
بە ئەو خوایەی کە ئەکوانی بەپا کرد
دەکۆشم بێ وچان تا دەرکێ وا کەم[٥]
بڕۆمۆ بۆ بەهەشتی نیشتمانم
لە ڕێیا ماڵ و گیان و تەن فیدا کەم

دەغەڵ پێی وایە دووری لێی ئەخێزێ[٦]
لە بیرم باتەوە چۆن چار پەیا کەم
هەناسەم بێ نەشەی سەودای وەلاتم
لە سێنگا حەپسە تا حەشرو حەلا کەم
بەڵام مەنگ[٧] و هەڵە و گێژ و نەفامە
مەگەر وەستاوە قەت حەول و وەلاکەم
بە هێنای[٨] کوردەواری مەستە (هێژا)
هەوای کوردی بڵێن تاکو سەما کەم

(١) شەڵتاخ: شەڕفرۆشی و گەڕوگوڕ. (٢) دووتاکردن: شکاندنەوە، دوولاکردنەوە، دەقکردن، واتە شکاندن. (٣) مشتومڕ: نیزاع و چنگە پرچێ، شەڕکردن. (٤) بەندی شاهۆ: زەنجیرە کێوی شاهۆ، سلسلە کێوی شاهۆ. (٥) واکردن: کردنەوە، بازکردن، دەرەکە وا کە، دەرکە بکەرەوە لە بنەڕەتا وشەی «وا» کردن، بازکردنە، جا لە ئیعلال و ئیبدالی کوردییا «و» بە «ب» و «ب» بە «و» ئەگۆڕدرێ.جا «باز» بووەتە «واز» و بۆ سووکی لەسەر زمان «ز» کەشی فڕێ دراوە (حذف) کراوە و وشەی «وا» بە مانای کرانەوە بەدی هاتووە. (٦) لێ خیزیان: لێ هاتن. ئەوەی لێ ئەخێزێ. واتە ئەو کارەی پێ ئەکرێ. (٧) مەنگ: وڕ، گێج، تێنەگەیشتوو. (٨) هێنا: نەسمە، سروە، سووسە.



## مەیخانە

دەرکی مەیخانەم لەسەر داخەن سەری شەو[١] تا سەحەر خۆم و خومخانە و خوم و خومگەر، تەک و بێ دەردی سەر تا لە نەشئەی جامی ساقی مەیکەدەی مەستانی دەیر کەیل و سەرخۆش و سەمە و خەندان سبەینێ بێمەدەر وەلوەلەی شۆر و نەوای گەرمم موغان[٢] بێنێتە خول تا لە(مەڕ)[٣] دەرچن بەرەو مەیخانەکانی ناو گوزەر جا لەوێ جەم بن هەموو شۆریدەکانی بەزمی جەم پوختەکانی[٤] تینی کوورە و سووختەیی بوریان جیگەر بەرگی تەسلیمی فڕێ دەن، بێنە گەردش پڕ لە شۆڕ قاڵەکانی[٥] ماجەراجۆی[٦]، هاوڵانی، کووزەگەر دەنگی ئاهەنگی نەوای مەستانی ئاسانەی نییاز[٧] سەر بە نازانی سەما خول دا بەرەو خوم بێ خەبەر سەر سەرای سەودا سەرانی سەر زەمین پڕ بێ لە بوت تا سەما کەن پێکەوە شۆڕشگەر و شۆریدە سەر کۆڕی[٨] مەینۆشانی بەزمی مەیکەدەی یەکڕەنگی جا جاڕی مەستیی بۆ بدەن، سەوداسەرانی با هونەر کۆبنۆ خونیاگەرانی[٩] ساز و سۆز، مینا بەدەست ئاگری دەن ڕەنگی مەینەتزای[١٠] من و تۆی بێ ثەمەر موختەسەر (هێژایە) تەئثیری نەوای ئاهەنگی حەق بەردەتاو، ئاسانە بۆ کوورەی دەمەی شەیدای خەتەر

(١) سەری شەو: هەوەڵی شەو، مەغریب. (٢) موغان: ڕەهبەرانی ئایینی (بەع) کە لەپێش زەردەشتیا باو بووە. (٣) مەڕ: کەورگ، غار. (٤) پوختە: سوورکراوە. (٥) قاڵ: لەکڵ دەرهاتوو و دامەزراو و پێگەیشتوو. (٦) ماجەراجۆ: موشاغیبی عەرەبی. کۆنەکەرەوە و نەترس. (٧) ئاسانەی نییاز: قاپی و بەردەرگای تەمەننا. (٨) کۆڕ: مەجمع: جەمگا و جەماوەر. (٩) خونیاگەر: ئاهەنگساز و، ئاهەنگگێڕ. (١٠) مەینەت زا: مەینەت بەکۆڵ، مەینەت هێنەر.

داکەوە! ڕێبواری تەنگەی کوێر و سووت
بیرتە ئەووەڵ جار کە هاتی ڕووت و قووت
چنگێ گۆشت و پێشە بووی، زار و زویر
دەوری خۆتت سەیر ئەکرد و مووتە مووت
بەرگ و سیپاڵت نەبوو بەستەزمان
بێ پەڕ و باڵ وەک مریشکێ ئاوەڕووت
وردە وردە گەورە بووی و بوویتە لاو
دەوری گرتی نەختە نەختە لات و لووت
کاتێ گەنجی ڕەشتی شکڵ و هەیکەلت
هاتە کایە فیز و ئەتوار لووت و پووت
کەوتە کەللەت یار و یاوەر کۆوەکەی
دەوری گرتی هاوسەلیقە تاق و جووت
فیز و دەعیەت دانەمرکا و کەوتە خۆی
ئارەزوو هێنایتیە باز و هەیت و هووت
نەفسی ئەممارەت هەڵینای، بێ خەبەر!
بۆ فزوولی و قیل و قال و شات و شووت
بژنەوە پەندم هەژاری نابەڵەد
حەیفە بفرۆشی بە هەرزان ئاووڕووت
بێ کەم و زیاد هەڵدەسەنگێ کردەوەت
وردبەینان سەیر ئەکەن چاک هات و چووت
کۆمەڵت کرداری ئەندام سەیر ئەکا
وا نەزانی هیچ و پووچە خوڵق و خووت
کاکی ڕێبوار خۆ مەگۆڕە و سادە بە
هەرچی بووی هەروا (بەهێژا) و ڕاست و ڕووت





برام، ئازادەیی سەیرانی سەر گۆ[1]
بە ئەمری کردگار خوڵقاین من و تۆ
حەقی کەس کوا بەسەرمانۆ لە بوونا[2]
مەچۆ ژێر باری مییننەت سا بە فیرۆ
بەدیهێنەر تەکە و لێت بێ نیازە
خڵەتیان عەیبە، بۆ نەیرەنگ و نارۆ؟[3]
بەشەر! تێفکرێ،! ئازادی گرانە
بەهەرزان دائەنێن هەندێ بەداخۆ
تەمادادری مەبە کاتێ کە ڕۆیی
بە دەس نایێتۆ ئەیهوو تاکو بێتۆ
خەڵاتی کردگار بەخشین گوناهە
مەگەر ئاسانە ئەو جورمە بە لاتۆ؟
ئەوە ناشوکرییە و کارێ خەتایە
دە نەنگی بەندەگی چیی دا بە دەستۆ؟
لەلای بێ بەند و بار، گەوهەر فرۆتن
مەبەستێ سووکە، بیری چی بکاتۆ
بە لایۆ قیمەتی کوانێ کەرامەت
لە مەجهوول، نابەڵەد چۆن سەر بکاتۆ
نەزان و گێج و بێ بڕوا دەبەنگە
جەفەنگ ئاسانە، مات بۆچی بباتۆ
لەمێژە هەر دەڵێ ئازادەیی ژێر
بەهەشتی بوڵحە گێتی بەم بیساتۆ
ئەوی تێبین[4] و وریا بوو و بڵێمەت
لە سەودای بار و نابار لێوی گەستۆ

به زێڕ و ماڵ و ئازی(٥) پووچی هەستی
هومای سەربەرزی ئازادی نەبەستۆ
لە بازاڕی مەتای ئازاد و دیلی
موسەللەم لێ بزان خاڵی نەهاتۆ
ئەوی (هێژا) بوو پاراستی بەپێی گیان
بە مەکر و فێڵ و فڕ، نەیدا بە دەستۆ

---

(١) گۆ: کورە، سەرعەرز. (٢) بوون: خەڵق، وجود. (٣) نارۆ: فێڵ و کەڵەک. (٤) تێبین: دەقیق، تێ فکریو. (٥) ئاز: طمع.



## گیان نیسار

بۆ ناحەقمە کە شەیدای نەرگسی مەست و خومارت بم
سەراسیمە و تەمادار و دڵە و دووا و بێ قەرارت بم
ڕەوایە تا سەحەر نەنووم، گلاراوم بێ بۆ دیدار
بە دڵ موشتاق و بێ ئارام، پەلەم بێ و ئینتیظارت بم
لە ناوجەرگەی غولاّمانا گەلێ خۆشە کە من بۆ خۆم
نموونەی دڵبراوانی حەقیقی و، گیان نیسارت بم
وەرە ئەی سەردەلیلەی ڕوو بە خالآنی خەیاڵ ئەنگێز
بە قوربانی نیگای پڕ میهر و سەودای جاروبارت بم
دەمێ میهر و، سەرێ کین و، زەمانێ لەنجەو و عیشوە
بە سەرگەردی عیتاب و میهر و جەوری ڕۆژگارت بم
نەویدی وەصڵ ئەدەی پاشان فیراقت دێتە سەر شانۆ
بە شۆری شەهدی ئەویان شاد و، بەمیان داغدارت بم
چییە ئەی شۆخ! کە هێندە تاڵبی خەوف و ڕەجای ڕەنجەی
چ سیرڕێکە کە مەیلت لێیە هەردە و تار و مارت بم
کە سەیری ڕەویەیی سەیرت ئەکەم زۆر دوور لە ئایینە
کە من وا سەر سپوردەم حەز نەکەی دڵخواز و یارت بم؟!
نەڵێی (هێژا) تەمادارە بەکاڵی پێ بگا و بڕوات
بە ویجدانم گەلێ پوختەم، ڕەوایە یاری غارت بم

## عاشقی بۆ جورمە بۆ؟

ئەهلی ذەوقم، واعـــیظا ، دەی کـــەم بلێ دێوانەیە
بیـــرو ڕای بێ جێ و بەتاڵە، کــردەوەی شــێـتــانەیە
خـۆشەویسـتی کـەی گـوناهە، عـاشقی بۆجورمـە، بۆ؟
کێ وتی بێ هەست و مـــردوو لایقـــە و فـــەرزانەیە
پێت وەهایە هەرچی دڵ تۆراوە، پیـــاوە، بێ خـــەبەر
دڵ کـــە شـــۆری تیـــا نەبێ، مـــاڵ ئاوەدان، وێرانەیە
شۆری عیشقە نەشئە بەخشی باڵی ئەندێشە و خەیاڵ
ئەی ڕەفـیق لەکـوێ هەڵات شـەم، دەوری پڕ پەروانەیە
ســا وەرە بای باڵ بدە، بۆی هەڵفــڕێ بێ ترس و بیم
هەر کــە تەن دەردا بە پەســتی پێ شـــیـــاوی تانەیە
هەر مـەرامێ دڵپـەسـەندە، عـاشـقـانە دووی کـەوە
کـــامگاری بۆ دڵێ جـــەذبەی نەبێ ئەفـــســـانەیە
شۆری مـەستی کـەی ئەسیر و گـیـری تەگبـیر مـاوەتۆ
ســازی بێ سـەودا لەکـوێ گـیـرایە، کـەی جـانانەیە
بەسـیە شـەیدا! سا وەرە بێ باک و سەربەس جاڕ بدە
عـیشق و مەسـتی، بێ ڕیبیا ، بۆ خەسـتـە دڵ هێلانەیە
گـەرچی واعـیـظ ظاهرا هەر مـەنع و لۆمـەی من دەکـا
چاک ئەزانێ پەندی (هێــژا) حـیـکـمـەتە و ڕیندانەیە



## دالەهۆ

دەشت و کـــێـــو ئاهەنگە، دەنگی چەنگە، ئاوای نەی ژەنە
«دالەهۆ»[١] ڕازاوەتۆ، پاکـــێـــو و، دەشـــتی گـــوڵشـــەنە
بانگەواز کـــەن[٢]: کـــۆبنۆ ســـیـــمین عـــوزارانی هەوار
«دووزەلە» و «سوڕنا»و «سەما» بیکاتە غەوغا و فەرتەنە
بەســـیـــە خـــامـــۆشی، لە دەیری بێ نەوایـــیـــدا هەژار
مـــەرد و ڕەندی[٣] پێ دەوێ ئەم چەرخـــە پڕ فـــێڵ و فـــەنە
هیچ نەوایێ[٤] تا ئەبەد مـــەقـــبـــووڵ و خـــۆش ئاوا نیـــیـــە
ئەمـــڕۆ نەرم و ســـاز و دڵگیـــر، بۆ ســبـــەینێ ڕیشـــخـــەنە[٥]
دوێکە یارۆ مـەست و شـاد، لەم چەرخە ڕازی، ئیـسـتـە وا
کـار و پیـشـەی شین و زاری و سێنگ کـوتان و شـیـوەنە
جـا کـەوابوو سـاقـیـیـا مـاتڵ مـەبەو زوو بێـرە خـوڵ
ســاز بێ هەر ســازێ کـــە ســازە، بیـــژەنێ کێ نەیژەنە[٦]
چەهچـەهەی خۆشخـوێنی جەرگەی نەو نەمامان سـەرکەوی
شـاد و کـام بێ هەر دڵێ تیـر ئاژنە[٧] و خـەسـتـەتەنە
مـەوسـیـمی گـیـرانی بەزمی سـەر هەوارە و «لادەوار»[٨]
گوڵ کلاو لارە[٩]، «کەما»[١٠] زەردو زووەردە و کۆکەنە[١١]
چارەیی ئاواتی تەن خـــەســـتـــە و مـــەلوول و دڵگران
سەر سبەینێی ناو دەواری دۆڵی کەسک[١٢] و دامەنە[١٣]
پڕ دەروونی ڕانە (هێـــژا) خـــۆی ئەزانێ چی ئەڵێ
کـاری شـیـوانشـێـوە، بێ بونیـادە گـێـتی گـۆبەنە

(١) دالەهو: کێوێکی بەرزە لەپشتی «کرند» و ڕێژاوی ناوچەی کرماشان کە بەهاری زۆر بەفەڕ و جوانە، خەڵکی ئەو ناوچە لە بەهارا دەواری تیا لێ ئەدەن. (٢) بانگەواز: جاڕدان، خەڵک بانگکردن بە دەنگی بەرز. (٣) مەرد و ڕەندی: زرت و زیندوویی و وریایی و چالاکی. (٤) نەوا: ئاهەنگ، بەزمی گۆرانی. (٥) ڕیشخەن: مەخسەرە، گاڵتە پێکردن. (٦) ژەندن: لێدانی مۆسیقی. نەیژەن: کەسێ کە نەی لێ

بدا. (٧) تیرئاژن: تیرباران کراو. (٨) دەوار: خێوەتی مووی ڕەش. (٩) گوڵ کڵاو لارە: واتە گوڵی گیا دانی گرتووە و قورس بووە «کڵاوەکەی لار بووەتەوە». (١٠) گیاییێکی زۆر بەکار و قەوییە بۆ ئاژەڵ و حەیوانات. (١١) کۆکەن: کاتی دوورینی گژوگیای کێو (پێی ئەڵێن کۆکەن) واتە کاتی کەندنی گیای کێو. جا کەما لەپێش گشت گیا کێویەیکانا زەرد ئەبێ وە ئەوە نیشانەی پێگەیشتنی گیای کێوە، چونکە زووتر بکنرێ تەرچکە و ڕەش ئەبێتەوە و بەکەڵک نایێ. دێریش بیکەنن ئەبێتە پووش، ئیتر ئەو خاصیەتەی نامێنێ. (١٢) کەسک: سەوزێکی جوان. (١٣) دامەن: پاکێو.





## ژانی ژین

بڵێسەی سۆز و سازم عالەمی گرتۆ، چ بەدبەختم
چلۆنم بەرگەگرت مامۆ وەکو خۆم، دیارە سەرسەختم
جیهانی کردە وەیشوومە، شەرارەی شوومی سووتانم
نەگۆڕا سازی ناساز، گوێ نەدریا وەختی بێ وەختم
هەموو بوو بە زوغاڵ و خۆڵەمێش هەستی عەزیزانم
کەچی هەروا بریکەی دێ زەڕی گەنجینەیی نەختم
قەدەر وای کرد ئەگەرنا خۆ لە دڵپاکی پتر[١] نەمبوو
سەبەب بێ پێی بەڵا شەل کا و، نەگاتە کەوکەبەی[٢] بەختم
ئەگەر مەندم بەلاتۆ وا نەبێ، هیی ناتەوانیمە
ئەبێ زۆر بوردە بار بم ڕووبەڕووی پەیکارگەری جەختم
ئەبێ بێ ڕادە هەموار کەم، حەریف، زووخاوی کردارت
دیفاع کەم گیان لەسەر کەف[٣] تا نەڵێن دژیاوی دۆزەختم[٤]
بە لاتۆ وانەبێ ئارام و پێ خستووم لە کردارا
ئیرادەم سستە ناکێشێ بەدووی خۆیا تەنی لەختم[٥]
لە مەیدانی جلیتبازیی جەمی چابووک سەوارانا
چ چالاکە کومەیتی لێ بڕانی شیک و خۆش ڕەختم[٦]
ئەوی چێوی لە دەستم دابڕی[٧] پێشهاتی زاڵم بوو
کە کۆڵی دا بە من ڕووخا بەسەرما بارووی پێتەختم
لە تووفان و تەلاتومدا جەسوور و مەحکەم و (هێژا)م
شەپۆلی بێ ئەمان ئەتوانێ شەق کا هەڵمەتی یەختم[٨]

---

(١) پتر: زیاتر. (٢) کەوکەبە: تەشریفات. (٣) گیان لەسەر کەف: ضرب المثلیکە بۆ لێبڕان بەدڵ و گیان ئەوترێ. (٤) دۆزەخ: جەهەننەم. (٥) تەنی لەخت: بەدەنی قەڵەوی تەنبەڵ. (٦) ڕەخت: زینەت، ئالاتی ئەسپ و ماین. (٧) چێوی لە دەستم دابڕی: دەستەڵاتی لە دەست سەندم. (٨) یەخت: لونکە، گەمی، قایق.

## دێر ئاشنا

چییە دێر ئاشنای سەرکێشی مەغروور!
چییە ئاواتی سەودای ئاشنا و دوور!
وەرە ئەی کیژی جوانی کوردەواری
وەرە گەنجی[1] ئەوینی پاکی مەستوور
دە خۆزگە تۆم نەدیبایێ بە ئێلاخ[2]
لەگەڵ خێلا نەهاتایێی بەرەو ژوور
دڵت داگیر نەکردایێم، بەجارێ
لەتاو تا سوورنەبوومایێتۆ پڕ شوور
دە ماڵ وێرانیی خۆم بیستم مەبەستێ
کە ڕۆژی ڕوونی لێ کردووم بە دەیجوور[3]
مەگەر مەجبووری، بەو جۆرە بەسەرما
سەرای ئاوات بڕووخێنیت و خاپوور[4]
بڵێی ئۆغر ئەکەم ئەمڕۆ و سەبینێ
بنەم ئەڕواتەوە مەڵبەندی باشوور[5]
بە کام بارا، عەزیزم، شایەتیمان
بهێنم صوبحی داغ و شامی کافوور[6]
لەدەس چوون و نەچوونت چارە کوانێ؟
شەوم زاری و، سبەینان شاد و مەسروور
شەوی عاشق گەلێ دوور و درێژە
ئەبێ سەبریشی بێ مەجبوورە، مەجبوور
مەگەر نازانی ڕەسمە عاشق (هێژا)
سەحەر شاد بێت و شام بێزار و ڕەنجوور

---

(١) گەنج: خەزانە. (٢) ئیلاخ: یەیلاق، کوێستان. (٣) دەیجوور: درێژ و تاریکترین شەوی ساڵ.
(٤) خاپوور: وێران. (٥) باشوور: گەرمیان. (٦) کافوور: مەعدەنێکە یا تەرکیبێکی کیمیاویی فێنکە بۆ موبالەغە لە ساردییا ئەڵێن ئەڵێی کافوورە.



بۆ خزمەتی پیری پیران چرای یەزدان شێخ عثمان

## قوربانە

قوربانە، فیدای تەکیە نشینانی جینانم
شەیدام، مەکە لۆمەی شەرەری شۆر و فوغانم
لەو کاتەوە دوورم، لە جەمی حەڵقەیی ذیکرت
دڵتەنگ و مەلوول و پەکەر و خەستە ڕەوانم
ئەی هوو! لە کەیۆ ئەم دڵە شەیدایە ئەڵێ من
غەوغای دەمی مەجذووبە دەواو مەرهەمی گیانم
شۆریکە دەسووتێنێ لەپڕ شارێ دەمێکی
هەڵلایەکە ناگونجێ بە دەم بێژی، ئەزانم
هوویێکی[1] موریدانی صەفاکێشی[2] خوداجۆی
هۆیێکە لەمەڕ سۆز و چڵی خەستە دڵانم
مەستن لەوێ پەروانەیی سووتاوی سیراجی
مەردی دەوێ زاتی هەبێ تا بێژێ لەوانم
سەودایی یو دڵخەستە وو سەرمەستی نەقشبەند
مەینۆشی وەفاکێشە لەوێ پیر و جەوانم
جەم جەم بە کەمەندی خەمی صەییادی خەرابات
بەستین[3] و تەماداری دەمی پیری موغانم
قوربانی کەرامەتیە، دڵ و گیانی کەمەنکێش[4]
حەیرانی صەفای عالم و زانایی زەمانم
ڕووناکە چرای دین! کە بە بەر تیشکی چراتۆ
ڕزگار ئەبێ ڕێبواری سەرا و کۆشکی ئەمانم
(هێژا)یە ئەوی دەستی بە تو گرتبێ (وەسمان)!
ڕزگارە لە مەکری دەدی غەدداری جیهانم

(١) هوو: بەو هوویە ئەڵێن کە دەروێش لە حاڵی ذیکرا بێ ئیرادە ئەیکێشێ. (٢) صەفاکێش: صەفا ئایین. (٣) بەستی: پەناهەندە. (٤) کەمەن کێش: بەو موریدانە ئەڵێن بەر لە دیتنی پیر ئیرادەتی پێ پەیدائەکەن وە ڕایان ئەکێشێ بۆ خزمەتی پیر و حەلقەی دیکەی.



## عالەمێ تر

وەرن، یاران! بچـــینە عـــالـەمێ تر
دەسەومل بین لەگەڵ جەرگەی جەمێ تر
سەرێ دەرکەین لە هەیت و هووتی دونیا
لە کـەین و بەینی گـێـتی و بەرهەمێ تر
هەتا کـەی پیـا بچـینۆ کـۆنە مـەتڵـەب
مــوتاڵا کــەین غــەمی پێچ و خــەمێ تر
بڕۆین شـایەد بگـونجێ چارەســەر کــەین
لەزامی کــۆنە بگرین مـــەرهەمێ تر
بکۆشین بـەڵکە ڕێگایێ پەیاکـــەین
بچـینە جـەنگ و غـەوغـای وەرهەمێ تر
ئەگـونجێ بازرەقـەی چەخـمـاخێ تازە
بزووسکی هەڵبگرســێنێ شـــەمێ تر
پەیا بێ ڕەهـنومـــایێ ڕێگە دەرکـــا
بەرەو کـۆشک و سـەرایی مـەحرەمێ تر
ئیـتر بەشکەم هومـای ئیـقبـاڵی ئێـمە
نەهێـڵی بێـتـە بەر خـامـەی خـەمێ تر
خـێـرەدمـەندانی هۆز، وریای خـەتەر بن
جڵـەو نەدرێتە دەس، کـەمتـەرخـەمێتر
ئیــتــر مــەیدان نەدەن بێ ڕەویە هەروا
بماناڵن غــــەڵەت بۆ مـــــاتەمێ تر
لە کـەل هەڵبێ سـتـارەی شـادمـانی
پشـــوویێ دەربکـەین تا ســـەردەمێ تر
بـەرەنج و ڕێبــــــەری و ئایین و زانین
بچـــینە ســـەر ســـەراو و لاچەمێ تر

له غەم هۆزی هەژاری ئێمە دەرچێ
بژی ئازاد و هەڵکا، پەرچەمێ تر
سەر ئەفراز جارِ بدا گوستاخ و پەرداخ
بلێ: یاساخە تاریکی و تەمێ تر
گەل و هۆزم ئەوەن (هێژا) و نەبەز بێ
نەیێڵی رِووبدا، رِۆرِۆ و، رِەمێ تر



## کوولەکەی رِۆح

له گوڵگەشتی چەم و خەمدا تەک و دڵشاد و سەرمەستم
له سەودای دڵفریبیدا گەلێ عەییار و تەرِ دەستم
لەلاتان وا نەبێ، هەر عاشقێکی دەسخەرِەی رِووتم
فیدایيم بۆ شەهادەت، چاوەرِێی تیر و شەقەی[1] شەستم
ئەگەر خوێنم برِێژێ تیری تیر ئەندازی دڵدۆزێ[2]
کە کۆباری وەها شانازییێ بم، دی[3] چ دەربەستم
سروودێ دڵنشینم هاتە گوێ، بەم جۆرە تاوی دام
نەوایی بێ نەوایی، هێندە کاری بوو دڵی گەستم[4]
بەسەر چەرخی فەلەکدا، فەخر ئەکەم، بەم بێ نەواییمە
بەلاتۆ وانەبێ وەیلانێ بێ مایە و کەم و کەستم[5]
له پەروازام بەدووی ئاواتۆ تەرِلانم[6]، شکەس ناخۆم
له چەرخی چەپ، مەگەر تیری قەدەر توند بێ له بن دەستم
هەزار کۆسپە و موصیبەت بێتە رِێم بێ شک پەکم ناخا
پەرِ و باڵم بسووتێ گشتی، تا لای لانە[7] ناوەستم
وەرە لات وا نەبێ شایەد کە پشکۆی ناو دەروونی من
دەبێ هێدی ببێتۆ تا پەکەر[8] داکەوم و رِاوەستم
کەلوپوورم[9] له دەستی دوژمنا، کەی ئەکرێ داساکێم[10]
فەرامۆش کەم گەلم، نادیدە بگرم چاترین هەستم[11]
بە یاران مژدە، هەستی گەوهەری پاکی ئەوین (هێژا)
هەڵئەگرێ کوولەکەی رِۆح و رِەوانیە تا له خەو هەستم[12]

---

(١) شەقەی شەست: شەقەی کەوان له کاتی هاوێشتنی تیردا. (٢) دۆزین: درووین، دورین. (٣) دی: ئیتر. (٤) دڵی گەستم: گازی گرت له دڵم، له دڵما کاری بوو. (٥) کەست: ناقص، ناتەواو. (٦) تەرِلان: بە مەلی شکاریی بێچوودار ئەوترێ، وە ئیشارەیە بۆ توند خووییی مەلی شکاری. (٧) لانە: هێلانە، مەرکەز، هەدەفی ئەصلی. (٨) پەکەر: مات و بێ دەنگ و پەککەوتوو. (٩) کەلوپوور: ئیرث.
(١٠) داساکیان: ئارامگرتن و وازهێنان. (١١) هەست: ئیحساس. (١٢) هەڵسمەوە: هەستم.

## کەین و بەین

ڕەنجی فەرهادی[1] بدەیت و جێی بهێڵیت و بڕۆی؟
شێتی دڵ خۆش کەی بە گێتی و کەین و بەین و هاتوچۆی
بۆ بکێشی مەینەتی نابار و ناهەمواری ژین
کاتێ بۆ دووری لە دیداری عەزیزان غەم بخۆی
مایەیی ژین و حەیات و کامەرانی! دڵ لەلات
مەینەت ئاوای عیشق ئەبشکێنێ بەدووتا کۆ بەکۆی[2]
من کە عیشقی خۆم بەسەر لەوحەی دڵۆ هەڵکەندبێ
نەخشی ڕووی سەنگ، کوا دەچێتۆ؟ جاویدانە خۆ بەخۆی
تێکەڵی ڕۆح و تەنە سۆزی ئەوینی ئاورین
داغە هەرچی مووڕەگی تێدایە بافت و تار و پۆی
سەر هەتا پێم سکڵە، پشکۆیە و دەسووتێ بێ وچان[3]
عالەمێکی گرتەوە، بۆسۆی پڕووزانی بەسۆی
کوا دڵێ وا داغ نەبێ، ئاگای لە دەردە و هەست ئەکا
کێ ئەزانێ غەیری عاشق سۆزی سەودای پڕ شکۆی
وەصفی دڵسووتاوی تاوی عیشق ناوێژرێ بە دەم
حاڵە[4]، دەتوانێ کە هەستی کا فوغان[5] و گوفتوگۆی
دڵ ئەگەر مایەی هیوای تیابێ بە هیچێ نابەزێ
وا لە کوورەی ئاوری عیشقا غەمی بۆ بۆ بخۆی
گەرمەشینی نیوەشەو هەی داد و بێ داد تا سەحەر
سوور ئەکاتۆ ناو دڵی سەنگینی (هێژا) تۆ بەتۆی

(١) ڕەنجی فەرهادی کینایەیە لە ڕەنجی بێ سەرئەنجام و بێ هوودە. (٢) کۆ بەکۆ: گەڕەک بەگەڕەک.
(٣) بێ وچان: بێ پشوو، بێ ماتڵی. (٤) حاڵ: هەر زمانی حاڵ ئەتوانێ چۆنایەتیی ئاوڕی عیشق تەفسیر بکات. (٥) فوغان: شیوەن.



## کەنەفت

هەڵەی پێت وابێ بێکارە و کەنەفتم[1]
کە تۆ دوڕڕی یەتیم[2] بی، من صەدەفتم
بەلاتۆ وا نەبێ، لێم بێ نیازی
لە بیرت بێ کە هۆی شان و شەرەفتم
ئەگەر تەنازی[3] جەرگەی مەهڕوخانی
منیش ئازادە گەنجی باهەدەفتم
لەسەرکێشی گەڕێ! نەرم و نیان بە!
ئەگەر پێی زیادی ڕاکێشی تە ڕەفتم
عەزیزم بۆیە توند نایێمە جەنگت
کە ڕوودەربایسی کۆنە و سەلەفتم[4]
وتم پێت ڕاست و ڕووت گەوهەر پەسەندم
لە کێت بیست موشتەریی مۆرە و خەزەفتم[5]
جەواهیریان نوواند هاتم بەدووتا
ئەگەرنا بێ ئەساس خۆ ڕێ نەکەفتم
خولم دەن زووگەش ئەبمۆ، ئەبمە پشکۆ
لە ئاتەشبازییا داغتر لە تەفتم[6]
پەرێشانی پەشیمانیتە ڕۆحم
لەپێش سەهوا هەراسانی ئەسەفتم
یەقین دڵسۆز و یاری تۆیە (هێژا)
هەڵینەگرێنی چاکە چاهی نەفتم[7]

(١) کەنەفت: پەککەوتوو، لێکەوتوو. (٢) دوڕڕی یەتیم: بە مرواریێ ئەڵێن کە تەنیا بۆ خۆی لە صەدەفێکا بێت. (٣) نازدار و پێکەوتوو: تەنناز. (٤) سەلەف: پێشینە، ڕابردوو. ئەجداد. (٥) خەزەف: مووڕووی بێ قیمەت. (٦) تەفت: تەلینەی ئاور یا چاتر بلێین زوغاڵ گەش کردنەوە. (٧) چاهی نەفت: بیری نەوت.

## شێره ژن

ده سەیری بەژن و بالای کەن ئەلێی سەروی گولستانە
سەرنجی دیمەنی مایەی ژیان[1] و شێرە ژن جوانە
تەماشای زولفی ئالۆزاو[2] بە هەر حەلقەی دلێ بەندە[3]
بە سەر شان و سەر و ملیا کە پەخشان و پەرێشانە
بە سەر هەرتاری گیسوویۆ دلێ بەسراوەتۆو دیلە
«تعالی الله» پەری ڕوو چەن قەشەنگە! مانگی تابانە
لە سەیری کۆرپەیی نازی، کە تێر نابێ بەنی ئادەم
لە باوەشیا دەلێی بەچکەی پەری یا حووری ڕیضوانە
خەتام کرد و بەسەرچووم[4] کاکە! شێرکۆ زادەیە ڕۆڵەی
نەوەی سولتانی ئەییوبی و صلاح الدین و بابانە
ده دەردی قۆڵ و بازووی تۆ گرم ئەی شێرەژن! چونکە
چەکی گیانبازی بۆ هۆز و فیداکاریت لەسەر شانە
گەمەی منداڵی ترساوو بزرکاوت جیگەر ئەبڕی
بزەی لێ دێ بە ناز ئەمما. لە نالەی تۆپ هەراسانە
قلەی شەصتیری[5] دوژمن وا لەگوێیدا و دەنگی ڕەشاشی
ئەگەر ناوچاوی تێکداوە و دژاوە و مات و حەیرانە
وەها باردێ کوڕم سۆزی ئەبێتە قارەمانی کورد
ده دایە! مژدە بێ! ڕۆڵەت بە بێ شک مەردی مەیدانە
لەگەڵ شیر چۆتە ناوخوێنی خەباتگێڕان و گیانبازی
فیدایە و مەرد و (هێژا)یە، کوڕی دڵسۆزی کوردانە

(١) مایەی ژیان: هۆی ئیدامە پەیداکردنی ژین، واتە ئافرەت. (٢) ئالۆزاو: دژیاو. (٣) لەناو هەر ئەلقەییێکی زلفیا دلێ دیلە. (٤) بەسەرچوون: ئێشتیباە کردن. (٥) قلەی شەصتیر: ڕزکردنی مەترەلۆز.
ئەم پارچە هۆنراوەیەم بەپێشنیاری خوشکی خۆشەویست و ئازیز «سورەیا» موفتی زادە لە شاری «سانهورە»ی کالفۆرنیای ئەمریکا هۆندەوە، هەڵبەت سووژی مەبەستە کە وێنەی ئافرەتێکی گەنجی خەباتگێڕ بوو کە لەڕەوەکەدا کۆرپەی لەباوەش و چەکی لەشاندا نیگەران و حەیران، بەڵام وەک شێری [illegible]یان دانیشتبوو، وازر و وریا سەیری ئاسۆی ئەکرد و چاوەڕێی پێشهات و ئامادەی خەبات بوو.



## کام با هەڵ بکا

بۆ پلوپووشی جەفا پێویستە کام با هەڵبکا
خەوش و خاڵی شیوی نەگبەت ئاوقەدی جەنگەڵ بکا
کام تەوانا بێتە مەیدان دێوی بەدخوو ڕابڕێ
تا نەیێلێ چینی مەزلووم موبتەلای گێچەڵ بکا
وا دەرەندووی کا ئیتر بۆی نەکرێ بەدکاری دەغەل
داو و پیلان بۆ هەژار ڕێ خات و کار سەنبەل بکا[1]
بۆ فریبی خەڵکی سادە بێتە خول ناکەس بەتاو
داخوڕێ بێ غەم لە خەڵکی بۆ چەپاو[2] قول هەڵبکا
ماڵی کورد و تورک و ئەرمەن، ئازەری و عارەب هەموو
دابماڵێ و خوێنی گەور و داسنیی تێکەڵ بکا ؟
بارەشێ توند و زەلانیکی زەبەن پێویستە بێ
تا خەتاکار و دەغەڵ دەستە و ملی ئەنجەڵ بکا
جا هەرێمی ژینی ئینسانی تەواو پاک کاتەوە
دێو و عیفریتی ستەم (هێژا) دەڵە[3] و بەرپەڵ[4] بکا

(١) سەنبەلکردن: ظاهرسازی و ڕاستەقینە ون کردن. (٢) چەپاو: تالان. (٣) دەڵە: خوێڕی، سەگی بەرەڵڵا. (٤) بەرپەڵ: ڕەجم، بەردباران.

## گەنجی ئازادی

سەرم پڕ بوو لە سەودا[١]، داخەکەم هیچم نەهێنادی
لە گشتی پڕ بەهاتر بوو، بەلامۆ، گەنجی ئازادی
نە تەنیا من بە ئومێدی گەیین بەو بارە خۆم فەوتان
ئەوی ئازادی خواز بوو کپ بوۆ هاوار و بێدادی
ئەگەر ڕاستت ئەوێ «عەنقا»[٢] بوو طەیری بورجی سەربەستی
لە «جابولْقا»[٣] دەبێ کڕ[٤] بێ لەلانا مورغی ناشادی
لەناو کوورەی جەهەننەمدا «سەمەندەر»[٥] وێنە لانی بێ
هومای سەربەستی هێند پووچ و قسەی بێ تامە بونیادی
وشەی پووچی عەدالەت هەر فڕوفێڵی من و تۆیە
ئەوی وا ناتەوان بوو کەی ژنەویا داد و فەریادی
بزانن حەق هەمیشە هەر، لەگەڵ زۆردار و ملهوڕ بوو
هەژار و ناتەوان ئەڕوا و لە بیر مێژووش ئەچێ یادی
وەرە ورد و بەدیقەت سەیری ژینی جانەوەر کەین، با
بزانین چۆن دەخوا زاڵم وەکوو هار، بێچوە هەمزادی[٦]
لە خیلقەتدا وەها باوە، کە ملهوڕ خاوەنی حەق بێ
هەژار داماو و بێ بەهرە و نەبیسرێ تا ئەبەد، دادی
حەقی مەزلووم، سزای زاڵم، عەدالەت، هەر قسەی پووچە
لەسەر کاغەز ئەنووسرێ، بۆ من و تۆ، جووان بە ئوستادی
نیظامی خواردن و خوریا لە کەونا باوە ناوەستێ
بە حوکمی فەلسەفە و ئایین، لەکوێ وەستاوە، شەددادی
عەدالەت نیسبییە، یاری عەزیزم، نابێ موطلەق بێ
خیلافی خیلقەتە، کوانێ مەهار[٧] ئەکرێ بە جەللادی[٨]
بەداغیۆ زۆر سەری نایۆ ئەدیب و، فەیلەسووف و ژیر
پەیامبەر چەندێ دیقی کرد لە حەسرەت ڕەنجی بەربادی



خەیاڵت خاوە پێت وابێ، دەبێ دونیا بەجەننەت کەی
مەحاڵە بۆت بگۆڕێ تاروپۆی و خوویی بونیادی
دە قەلبی ماهییەت[٩] لەکوێ کراوە، کەینێ گونجاوە
نەکەی ئەو ئیددیعا تا پێت نەڵێ: فەهمیدە! شەییادی
بە مەنطیق نارەوایە بۆ بەشەر دەعوای مەلەک بوونی
لە ناحەق بۆ بکێشێ، دەعیە زل! ڕەنجێکی فەرهادی
گەلێ (هێژا)ی لە ڕادەی خۆت وەدەر هەنگاو نەنێی عاقڵ
بە مەیلی کەس نەنیشت مۆرەی جیهان، دۆڕاوە نەڕرادی

(١) سەودا: ئارەزوو، ئارمان. (٢) عەنقا: تەیرێکی ئەفسانەییە. (٣) جابولْقا: ئەویش دەشتێکی ئەفسانەییە. (٤) کڕ: نووستنی مەل بەسەر هێلکەوە لە هێلانەدا. (٥) سەمەندەر: مەلێکی ئەفسانەییە ئەڵێن لەناو ئاودا ئەژی. (٦) بێچوە هەمزاد: بێچووی لفە دوانە (توام)ی خۆی، یا هاوجنسی خۆی. (٧) مەهار: کۆنترۆڵ کردن، پاراستن. (٨) جەللادی: بە ئیجباری، بە فەرزی. (٩) قەلبی ماهییەت: نەفی کردنی خصوصیاتی شت. بۆ نموونە گەرما لە ئاور برێن، یا تەڕی لە ئاو نەفی کردن. یا نیسبەتی گەرمی لە یەخ دان.

# گرۆی شەیدایی

به سـۆزی ئاهی داغی خـەسـتـەدڵ هێـمـان نەسـووتاوی
به شـەسـتی تیـری ئاوداری جـەفـا جـۆیێ نەپێکراوی
لە پیاڵەی دەستی ساقیی مەجلیسی بەزمی خەراباتی
لەسـەر ناز و گـریشـمـە و بێ مـوبالاتی نەڕەنجـاوی
ئیتر غەوغا و هەرا و بێ داد و فەریادت ئەبێ چی بێ؟
لە کـایەی[١] دلبـەریی عـەییـاری نازدارا نەدۆڕاوی
پەلە و داد و هەیاهووت ناژنەون مـەسـتـانی مـەیخـانە
ئەڵێن: کوورەت نەدیوە، پوختە نیت، سوورۆ نەکریاوی
گەرەکیانە، بە دابی[٢] مەکتەبی شەیدا گرۆت کەن چون
ئەڵێن: هێـمـان نەپاڵێـویاو و، زاخـاویش[٣] نەدریاوی
ئەگەرچی گڕ ئەخاتۆ بازرەقەی چەخمـاخی پەرداخت[٤]
بەڵام هێـمـان بزووسکێ سـۆزناک جـەرگی نەپێکاوی
لەخۆیۆ کوورەیی گیـان سۆز لەکوێ بینراوە تاو بگرێ
گـڕ و گلپـەی دەمـەی پیـری ئەوێ تا هەڵگرێ تاوی
بەلاتۆ وانەبێ، ئاییـنی سـۆز و سـاز شـتێ سـادەس
کە هێنای سارد و تەئثیری صـەفا نەتگاتێ فـەوتاوی
برۆ دوردی[٥] کـەشانی مـەحرەمی خومخـانە پەیدا کـە
دەسـەو داوێنی مـەسـتـانی هەوا بە! تاوەکـو مـاوی
لە دەورت کۆ وەکە حەڵقە لەگوێی، ئەهلی وەفا سەرجەم
لە ساقیی جەم تەمەننای جورعە کەن، بێژن کە تاساوی
یەکێ دوو پیـاڵە نۆشـداروو لە سـاقی وەرگـرن جـا تۆ
غـرووری پێ بسـووتێنە کـە ڕزگـار بی لە زووخـاوی
بەڵام وەسیەت بێ بۆ تۆ نەوڕەسیدەی خام لە خومخانە
سـەبر ئایین و بێ دەعـیـە و دەمـار بە، وەرنە دامـاوی



وەکو (هێژا) سەبوور و خاکی یو ڕووخۆش و خەندان بە
کـە لایان وانەبێ مـەغـرووری، یا یەکـجـاری بەزیاوی

---

(١) کـایە: بازی. (٢) داب: ڕەسم، عـادەت. (٣) زاخـاودانەو: ئەو مـەحلوولە کـە بۆ پاککردنەوەی زێڕ بەکارئەبرێ. (٤) پەرداخ: تیژکردنەوەی بەرد، یا ڕێککردنی. (٥) دورد: خڵتەی شەراب.

## صەفام چاند

دەسەو داوێنی عەشقی بێ ڕیبیا بووم
هەتا دڵ حەز بکا جیددی و لەدووی چووم
ئەوی بەندم لە ڕێدا بوو پساندم
کە بەش دڵ لانەکا لای ئارەزووی زووم
پشوو بگرێت و دامەرزێ بەلایۆ
نەجاتی بێ لە تاڵووکەی هەوای شووم[1]
بە غەیری خۆشەویستی هیچ نەزانێ
نەبیسێ سەرگوزەشتی ڕەنجی مەزڵووم
بلا![2] شادان و خەندان ڕۆحی شیرین
بگاتە بارەگای ئاواتی پێشووم
لە کولبەی پڕ صەفای عیشقا بمێنێ
بەپێی دڵخوازی کۆنە و ڕابوردووم
حەزم لێ بوو بەهەشتی کامەرانی
ببێتە پایەگای فەرزەندی[3] زیندووم
ئەگەرچی تاڵوکە و مەینەت بوو ڕێگەم
لە کووڕە دەرنەچوو[4] نەفسی خەواڵووم
خیرەد کۆڵی نەدا و ڕێگەی نەگۆڕێ
بەبیر یا هیچ نەهات: داماو و ماندووم
لە بیر و ڕای کوڕ و کاڵا صەفام چاند
گوڵم کێلا[5] لە باغ بۆ نەسڵی پاشووم
هیوادارم لە ژینا ڕۆڵەکانم
نەدەن ڕەنجم بە با، کاتێ کە تیاچووم
لەدووی سەودای موحەببەت بن هەمیشە
لەدەس قەت بەرنەدەن ڕەویە و خدێ و خووم



چ ساردە ژین بەبێ تینی مەحەببەت
مەزەی کوانێ بژیت تەنیا وەکو بووم
لەگەڵ جەمعایە نەشئەی بەختیاری
خدێوی میسری تەنیا پەستە مەعلووم
دە شەرتە بۆ جینانی خۆشەویستی
لەگەڵ خەڵکا بڕۆم (هێژا) وەکو چووم

(١) هەوای شووم: ئارەزووی شووم. (٢) بلا: بهێڵە، لێگەڕێ، واز بێنە. (٣) فەرزەند: ڕۆڵە، ئەولاد.
(٤) لە کوورە دەرنەچوو: لە ڕێ لای نەدا و کۆڵی نەدا. (٥) گوڵ کێلان: ئەڵێن فلانی لەبارەی فلان کارەوە گوڵی کێلا، واتە حەقی مەتڵەبی ئەدا کرد، باش لەعوهدە هات.

## هەربەنە

کوڕوکاڵ کاتێ شەو زرنگایەوە[١]
گشتی کۆبۆ و، کەس نەمایەوە
لە بانی مزگەوت هەموو یەکگیر بوون
بۆ ڕاوێژکردن کەوتنە هاتوچوون
«ڕەشە»ی مام «خولە» وتی: کوڕینە!
گشتتان ئەزانن دواییی هاوینە
فڕکەی قنگلاشک[٢] پیاو ئەتۆقێنێ
کەو لە سەربەرزان ئیتر ناخوێنێ
شەقەی شەلاخی «ڕەشەبا» و «زەلان»
ئەڵێ پاییزە و زوقمی بێ ئەمان
بووار[٣] بەرەو خوار ڕووە و گەرمەسێر
ئەڕواتە شەوگەی بنکاو[٤] و تاوێر
زوورەسە ئەمساڵ پاییز و زستان
پێویستە زووتر کەوینە خۆمان
کەلام[٥] وەکو خۆی بە کوێستانەوە
لەئالفجاڕا هەروا ماونەوە
بێن شانی پیا کەین بەڵام کوڕانە
برایان! ئەمڕۆ و سبەی زستانە
«جەوال» و «کژگ»، «ڕەشکە» و «تەلیسە»
خەینە سەر ولاخ، بڕۆین هەر ئیسە
«تەنگ» و «گوریس» و «چەڵەم» و «ژێر تەنگ»
هەڵگرن خێرا ڕێکەون قەشەنگ
خۆلاسە بەدەم قسە و باسەوە
کاروان هەڵجوی لە ڕێی ڕاسەوە



دەنگی زەنگ و قۆڕ هەستا لە کاروان
زڕەی زەنگۆڵەی جاش قاتری جوان
پرمەی پێشاهەنگ[٦]، حەچەی قەتارچی
پێچیایە ناو دۆڵ: ڕۆلە بە خێر چی
پێچ پێچی ڕێگە بەرەو ژوور پشت دێ
گیرایە پیش و بوو بەکێوەر کێ[٧]
ئاواز و نەوای «چاوڕەشە کاڵێ»
سەدای «بارمەکە» و «هەی خاڵخاس خاڵێ»
گۆرانیی گەرمی «ئەی خاڵۆی ڕێبوار»
«چی بکەم سا چی بکەم» چاوڕەش، کڵاو لار
«سیاوچەمانە»ی کۆنی پڕ تەئثیر
«قەتار»ی خۆشی جوانی بێ نەظیر
بە دەمەتەقێ و چەپڵە و گۆرانی
«هەربەندە» بە خێر گەییە سەر کانی
کاروان گەیشتە جێ ژوانی کوێستان
جێ بنەی سەرجەم لاوی سەر هەردان
جا بەدەم خەوۆ کوڕوکاڵی دێ
یا لاوی نووستووی سەرهەوار، ناو جێ
ئەزانێ مەزەی دەنگی «هەربەنە»
یا زڕەی زەنگی کاروانی چەنە
کاتێ ئەیژنەوێ بێدار و نووستوو
یا بە دڵ بێدار بە دیدەی خەوتوو
ئەزانێ بایی نەوای هەربەنە
لە کانی دڵدا تەئثیری چەنە
جووت جووت و سێ سێ لاوی پێکەوتوو
ئەڕۆن بۆ کەلام یەک یەک و دوو دوو

به کۆمەکی یەک بار دائەگیریێ
ئەکەونە هەوڵی ڕۆیین بەرەو دێ
ئەمجارە قاتر ئەبرێتە بەربار
گشت بار ئەکریێ بارخانە یەکجار
جا ڕایئەماڵن بەرەو ئاوایی
بە«حەچە» و «تەسە»[8] و بە دڵنەوایی
هەربەنە لەگەڵ لیزگی هەتاوا
دێتەوە ناودێ گشت ڕۆژێ ئاوا
وڵاغ بە ڕۆژا و گەرمای نیوەڕۆ
تەنگەتاو ناکەن بیکوژن بێ خۆ
بە شەو فێنکە بەرەو ژوور کەی کێو
ئاسان نەبڕیێ بۆ باربەر و خێو
لەو سەرۆ باری سەنگین ڕێی هەڵەت
بەو گەرما نابڕن پڕ جەور و مەینەت
بە ڕۆژا باربەر، لاوی «هەربەنە»
ئیسراحەت ئەکا بە شەو گۆبەنە[9]
بۆ ماوەی مانگێ ئەوە کاریانە
کادان پڕ ئەکەن لە سەوزە و دانە
بەو ڕەسمە ئەڵێن «هەربەنە»ی هاوین
خەڵکی سەردەسێر دێی پاکێو نشین
ویستم ون نەبێ ئەو ڕەسمە کۆنە
پاشەڕۆژ نەڵێن «هەربەنە» چۆمە
(هێژا) لای وایە ئەو ئاینانە
ئەبێ بزانرێن تا دێر زەمانە

---

(١) شەو زرنگایەوە: شەو تاریک بوو، دوای عیشا. (٢) قنگڵاشک: سەوزەی درشتی گەڵاپان وشک ئەبێ و با هەڵیئەگرێ و ئەیبا بەرەو کەناو پێی ئەوترێ «قنگڵاشک». (٣) بووار: مەل هەندێکی



گەرمیان و کوێستان ئەکا و لە کاتێکی تایبەتی پێکەوە کۆچ ئەکەن. بەوە ئەوترێ بوار، چە لەگەرمیانەوە چە لە کوێستانەوە دەست پێ بکا. (٤) بنکاو: پەناگای کێو. تاوێر: درگەی بن بەردی گەورە. (٥) کەلام: بە خەرمانی ئاڵف ئەوترێ کەلام. (٦) پێشاهەنگ: بە هێسر یا یابووی پێش کاروان ئەوترێ، جا عادەت وایە باش ئەڕازێنرێتەوە و جل و سەرجلی تازە و زەنگ زەنگوڵەی زۆری پیا ئەکەن. (٧) کێ وەر کێ: موسابەقە. (٨) حەچە: فەرمانێکە بە بارەبەر ئەدرێ کە زوو بڕوا. «تەسە»: فەرمانێکە قەتارچی بە دوو باربەری ئەدا کە ئەترنجێنە یەک، ئەڵێ: تەسە. (٩) بە شەو گۆبەندە: واتە بە شەوا ئەیکەن بە گاڵتە و گەپ و بەزم.

## قەرە خواجە ڕۆ

لە دەوری بێــچــولانا خــواجــە ڕۆ هەســتــا قــەرە زوو کــە!
ئەڵێن دێو زۆری هێناوە، دە خــێــرا چاری بێــچــوو کــە
بە ظاهیــر مــەخــڵــەتێ، پیــلانگەرە، گــوێ بگرە ڕۆ ڕۆ دێ
هەراکــە خــواجــە ڕۆ! چارێکی هار و پەست و بیــژوو[1] کــە
لە دەوری بێــچــوەلانا[2] خــۆی مــەڵاس داوە کــە هەڵمــەت دا
دە تاری نێ و، ســەگی تێکە، هەتا بێ گــیــان و بێ تووکــە[3]
قەرەی خواجە! ئەگەر مووڵەت بدەی پەتیارە[4] گیان بگرێ[5]
تەمــاشــای فــیــز و ئەتواری تەرەس کــە و ســەیری بەدخــوو کــە
لە دەوری بێــچــوەلانا خــواجــە ڕۆی، دڵســۆز و یاران دێ
دەســا ئەی پاســەوان، ئامــان! دەغــەڵ تار و دەرەندوو کــە
ئەڵێ هەی خــواجــە ڕۆ! فــریا کــەون یاران لە بێــچــوولان
قــڕانی گــەورە ڕووی دا، چاری بەچکە و داکی بێــچــوو کــە
بەقــیــرە و داخــوڕین و قــرم و قــاڵ پڕ ڕوو لە ڕووناچێ
قــەرەی زاڵ![6] بێــرە مــەیدان کــار بە گــورز و زۆری بازوو کــە
بەقــوربانــە مناڵ و کــەوتە کــار و ئافــرەتی هۆزت
ڕەوانەی ســەنگەر و قــەلعــە و حــەصــار و بورج و باروو کــە
دەخــیلە! دەوری بێــچــوولان بە مــێــرد ئازای خــەبات بگرە
لە ئەندامی فــیــداکــاری گــەلت تا ئەکــرێ ئۆردوو کــە[7]
قــەرەی قــۆڵچی[8] هەرای لاوان بەبێ بایخ نەزانی قــەت
لە لاتان وانەبێ بێــچــوو لە پاراستن کــەمــە و ســووکــە
ئەبێ چاوت بە ســوور گــریان و لاشــەت خــوێنی لێ بتکێ
هەتاکو بێچوە بێ وەی[9] بێ، یەلی[10] (هێژا)! یەک و دوو کە

---

(١) بیژوو: حەرام زادە، زۆڵ. (٢) بێچولان: جێی کۆبوونەوەی ژن و منداڵ لە تاڵان و بڕۆدا. (٣) بێ گیان و بێ تووک: زەعیف و لاواز. (٤) پەتیارە: بێ بەندوبارو، بێ ئابڕوو. (٥) گیان گرتن: قەوی بوون. (٦) زاڵ: پیرۆز، مووەفەق. (٧) ئۆردوو: لەشکر. (٨) قۆڵچی: نۆبەچی، پاسەوان. (٩) بێ وەی: بێ ئازار. (١٠) یەل: پاڵەوان. قەرە قەرە خواجەڕۆ: بازییەکی کوردییە، ئەم کایەیە لەناو گەنجانی دێدا باو بوو، کوڕوکاڵی دێ ئەبوون بە دوو دەستە، دەستەیەکیان لەگەڵ (قەرە) واتە جەوانێکی ئەسمەر یا ڕەشا، بەهاوکاریی خواجە واتە پیاوی موناسبی دێ، لە ڕۆژی هەیهاتا منداڵ و مەزنی دێیان ئەپاراست. دەستەی دووەم، دەستەی تاڵانچی بوون ئەیانویست دێ تاڵان کەن. گەنجانی بەهاوکاریی خواجە و قەرە ئەوانیان تار ئەنا جا لەوکاتەدا گەنجان بانگیان ئەکرد جواجە ڕۆ، خواجە ڕۆ، قەرە قەرە خواجە ڕۆ دەغەڵ وا لەدەوری بێچوولانا فریاکەون. سەرئەنجام تاڵانچی ئەگیرا و نەیاندەهێشت لە بێچوولان و منداڵانی لای خواجە دیل بکرێ. جا منیش دەرفەتێک پێش هات بۆ ئەوەی خواجە وریای بێچوولان بێ. وە هەروەهاش ئەو کایە لەبیر نەچێتەوە، هۆندمەوە.

## شاری خامۆشان

کز و بیمار و زار و دەردەدارم
سەرت لێم سڕ نەمێنێ وا هەژارم
لە پێ کەوتووی بەرەو ژوورەی ژیانم
شپرزە و لێو بە باری کاروبارم
لە خۆڕایی لە کاروان جێ نەماوم
تەکەم دێ و کەوتەکار و بێ قەرارم
سەر ئاسۆی شاری خامۆشیم ئەکێشا
نە خوێشم دی نە دۆسم دی نە یارم
گەلێ بارم گران و قورسە هاوار
عیلاجێ! کوا برینی نادیارم
خەفەتبارم، غەمم سەنگینە سەنگین
عەزاداری گەل و دار و دیارم
لە کۆزگە و ماڵ و خانە و لانە مەحرووم
هەموو ماڵ کاولن عیل[1] و تەبارم
پەکەر[2] چۆن دانەمێنم مات و بێ دەنگ
دە کوا دڵسۆزێ سەر دەرکا لە کارم
خەریکی ئاوەدانین خەڵکی گێتی
بەڵام وێرانە کۆشکی گوند و شارم
سپای دوژمن بە بوڵدێزر ڕماندی[3]
هەموو کۆشک و سەرا و دار و نەدارم
ڕەوایان پێ نەدیم خانووبەرەم بێ
ستەمگەر کەوتە کوشتار و بژارم
حەرام کریا لە من کۆزێ، کەلێنێ
پشووی تیا دەم، بژیم «بەستیانە کارم»[4]



حقووقی کتکێ، کەروێشکێ، «دووپایێ»[5]
بە من نەدرا بەسەربەم ڕۆژگارم
کون و کۆزگە و کەلێن و کەپرێ کوانێ
کە من تیا ڕۆژ کەمۆ شەوگاری تارم
لەسەر عەرزی خودا و جێی باو و باپیر
وەدەریان نام و وێڵ و تارومارم
دە توخوا بەس بێ «لاهە»و دادگای پووچ
دە «شوورای ئەمنییەت» کەی گەییە کارم
بەخوا «مافی بەشەر»[6] هەر گوفتوگۆیە
لەکوێ بیسرا «نزا»ی[7] هۆزی نەزارم
لە مافی ئاژەڵانیش ئێمە بێ بەش
حەقی پەستر لەوانە قەوم و کارم
حەیای «داد» و شەرەف بریا بە دەعیەی
پڕوپووچی سەرانی دەس بەکارم
قسەی زل تا بڵێی ئەکرێ، بەڵام کوا
نەتیجەی فیز و دەعیەی «کارگوزار»م[8]
دڕەندە چاترە (هێژا) بە ویجدان
لە دەستەی حاکمی بێ بەند و بارم

(١) عیل و تەبار: عەشیرە و طائفە: قەوم و کەسوکار. (٢) پەکەر: عاجز. (٣) ڕماندی: ڕووخاندی.
(٤) بەستیانە کارم: خدییان تێدام. (٥) دووپا: نەوعێ مشکی بیابانیی گەورەیە کە بە دوو پێ ئەچێ بەڕێوە. (٦) مافی بەشەر: حقووقی بەشەر. (٧) نزا: پاڕانەوە بە گریانەوە. (٨) کارگوزار: موجریی کار.

## ورچی باروول

دەسەو داوێنی باروول بووم کەمێ دێقم لە دڵ دەرکا
بڕێ باڵی خەیاڵاتم بگروێ و تووکی پەڕ، پەڕکا
بڕووخێنێ قەڵا و کۆشک و سەرای ئاوات بەسەر عەقڵا
خەلاسم کا لە بیری کۆنە، موستەغنیم[١] لەوەوبەر کا
ئەوی قەید و قویبوودە گشتی بشکێنێ بە لاقەیدی
قەڵاچەی بێ موبالاتی بە بێ باکی بە سەنگەر کا
لە تیر و تانە لام دا هەر توانجێکم کە تێبگرن
بە فیشقییات[٢] و لاتایل پەکیخا و ڕەنجی بێوەر کا
ئەویش دایە دەرەی شۆخی و، ڕسوومی گرتە بەر کایە[٣]
کە ڕۆح ڕزگار بکا، بەشکەم نەمامی شادی سێبەر کا
غەمی ڕاونا بە شۆخی و گاڵتە، هەر بەو جۆرە عادەتیە
هەتا کەشتیی شڕی شوومم ڕەوانەی گۆمی بەندەر[٤] کا
لەپاشان ڕووی لە من کرد و وتی: گوێ بگرە ئەم نەقلە
بەکەڵکە بۆ ئەوەی ژیر بێ و موتاڵای بیروباوەڕ کا
لە دەستی خرسەوانێ[٥] حورچێ ئەستوور و زەلام دەرچوو
حەزی لێ بوو لەگەڵ گەورە و بچووکا تێوەچێ و شەڕ کا
چەپۆکانی ئەکرد و سۆڕ و هۆڕی بوو بەدەورخۆیا
ئەخولیاوە و لەپی ئەکوتا، هەتا چنگێ بە خوێن تەڕ کا
ئیتر گوێی لێ نەبوو، بۆچی؟ لەسەرچی؟ بۆ چ ئەنجامێ
تەرەف کێ بێ و، لەکوێ بێ و، بۆچی وا ڕەفتارێ بێفەڕ کا[٦]
لەپێش گشتا دراوسێیێ، زەلام و کۆنە کاری بوو
هەرای دابەست لەگەڵیا، تا ئەویش تووشی شەڕ و گەڕ کا
حەریف قورس و سمنج و[٧] دڕ بووزوو ڕایدایە مەیدانی
سەر و بەچکی وەها شێلا شپرزە بانگی داوەر کا



قسەی خۆمان بێ چنگدارانی[٨] وەحشی و ئاژەڵی جەنگەڵ
بەدڵیان بوو کە ئەو مەغروورە خۆی دووچاری سەگوەڕ کا
بەڵام لەملاش درندەی ناوچە لەو مەوضووعە ترسی بوو
حەشی[٩] کۆنە، کە زاڵ بێ و دایکوتێ کێ بێ کە ئەو دەرکا
لە حەیبەت ئاورا[١٠] پشتیان بە ئاو بەست کۆڕی گیانداران
بە ناچار بوونە یەک، بەشکەم، نەهێڵن بێت و تێپەڕ کا
سەرئەنجام بوو بە عێلجاڕی[١١] بەسوودی حورچی زیانە خرۆ[١٢]
ئەوی دەسیان چوو، دایانێ کە چاری گێچەڵ و گەڕ کا
لە گیروداری ئەو گۆبەندە ناوترێ کە چی قەوما
لە ئەرکی ئەو شەڕ و داوا حیسابگەر کوانێ سەر دەرکا
کە زانی وایە خرسی کۆنە، لێ بڕیا، بەئامانەت
دەمێ لەو کێشە واز بێنێ، کەمێ ڕاوەستێ مەندەر کا[١٣]
کە حورچی شەڕفرۆش بۆ ماوەیێ توانی پشوو بگرێ[١٤]
دەماخ دیسانەوە چاخ بوو، هەوای کرد دەم بە خوێن تەڕ کا
هەنێ هاوسێ و براوسێی لێ نەزان بێ ڕادە هەڵیان نا
بەمە ئەو عەیبە هەموار کا[١٥]، کەسێ تر خۆی بە سەروەر کا
ئەویش با کە وتە کەللەی، جا نەڕاندی و هاتە سەر پاشوو[١٦]
غرووری سا چلۆن ڕازی ببێ؟ ئەو با بە چی دەرکا؟
دەغەڵ[١٧] لەویا سمۆرە کەوتە پێش چاوی، سەڕاندی: بۆ؟
ئەبێ ئەو قنجە چاپلووسە[١٨]، مودام بازی لەسەر زەڕ[١٩] کا؟
پڕی دایە «سمۆرە»ی، بەسەزوانی هاوسێی، ویستی
ئەوی زێڕی کونوکۆ کردبوو، گشتی لە دەس دەرکا
لە ئەم هەڵڵایە «ئەسپ» و «گا» و «کەر» و گیانداری ناو جەنگەڵ
لەترسا کەوتە خۆی بەڵکو عیلاجی کار بە داوەر کا[٢٠]
گرۆییێتر کە پشتیوان سمۆرەی قنجی زەڕڕین بوو
بەجارێ هاتە جەولان و جمۆجۆش تا دەغەڵ دەرکا

بلـّـێم چی «کــتکە نەوتینە»[٢١] چلۆن بۆی کــەوتە هاتوچوو
کـە ئاور هەڵگرێنێ و خـۆی بە خـێـرئەندێش[٢٢] و ڕەهبـەر کـا
لەســەر مــافی «پەپوولەزەڕبدە»[٢٣] غــەوغــا و هەرا هەســتــا
نەمــا نینۆک و دان وا باش نەســاورێ کــاری نەشــتــەر کــا
فــزوول داکــۆکی بۆ جــوانی، تەرەس بۆ مــافی ئینســـانی
دەغـەڵ بۆ بێ کەسی خنجیلە، کـەس کوا ئارەزووی زەڕ کا ؟![٢٤]
هەمــوو بۆ مــەعنەوییــات و مــەرامی گــیــانلەبەر دۆسی
ئەبێ هەســـتێ دژی یاغی، بە نینۆک و بە دان شـــەڕ کـــا
بەڵام حورچی چەمـووش[٢٥] هەر دانەمـرکـا و گـوێی نەدا تەهدید
سەرئەنجام وەحشی بەڕ و بەحر ئەبێ ئیعـلامی[٢٦] کـەیفـەر کـا
لەلایێ «کـەرگـەدەن» ، لایێ «پڵـنگ» و «فـیل» و مـام «ڕێوی»
لەلایێ «حورچی چەرمـوو» قـاو[٢٧] لە «کەمـتار»ی شەلی گەڕ کا
خــوڕین و گــرم و هۆڕ و قــرم و قــاڵ و دەنگی قـــیــــژ و واژ
خــەریک بوو گــوێی بەنی ئادەم تەواو کپ کــاتەوە و کــەڕ کــا
هەژار کوشتن، زەعیف خواردن، چەپۆکان[٢٨] و چەمووشبازی[٢٩]
ڕەواجی گـرت هەتا وەحـشی چلۆن کـەیفی بێ کـەر سـەرکـا
لە شێـر کـەڵبە، لە هێسـتـر جـووتە، ڕێوی مەکـری ڕەنگاوڕەنگ
کـە بەش حورچی تەرەس سـەودای «بوتی زەڕڕین» لە سـەر دەرکا
ئیـتـر کێ مـرد و کێ کـوژرا، سـتـەمگەر بۆ چەپ و گـوپ کـا[٣٠]
هەژار و زار و بێ غــەمــخــوار، لەکــوێوە دەرچێ خــۆی دەرکــا
نەبوو مـەنظوور و مـەتڵەب گـیان و مـاڵ و موڵـک و ڕۆحی کـەس
ڕەوایان دی کــە زیانەخــرۆ هەمــووی لەت لەت بە خــەنجــەرکــا
کــەسێ نەیپـرسی کــەوتە پشــتی گـوێ،[٣١] ڕۆی مـافی بێ چارە
ئەوی ئاوارەیە و وێڵـــە، ئەبێ هەر ئەمــــســــەرەوســــەر کـــا
لە ناحــەق جــاڕ درا وەحــشی ســـزای چەشت و تەمێ کـــریا
بلـّێن! کـوشـتـاری کـەی وەسـتـان؟ پەکی دا ئەمـبـەرەوبەر کـا ؟



غـەرەز کـوشـتـارە[٣٢] کـەی فـەرقی بووە لای ئەو کـە کێ ئەکـوژێ
مــەرامی ڕشــتــنی خــوێنە، مــەجـاڵـیــان داوە مــەحـشــەر کــا
بڕۆ (هێــژا) ئەتوش بۆ خــۆت حــیـســـابی کــە و بڵـێ بۆچی؟
ئەبێ عــاقڵ بەگــوێی خــوێنخــوار و دێوی شــوومی بێ فــەڕ کــا

---

(١) موستەغنی: بێ نیاز. (٢) بەفیشقیات: هەڵـیت و پەڵیت و مەخسەرە. (٣) کایە: گاڵتە. (٤) گۆمی بەندەر: ئەو گۆمەیە کە کەشتیی تیا تەعمیر ئەکەن. (٥) خرس: ورچ بە زاراوەی کرماشانی و بێجاڕی. (٦) بێ فەڕ: ئێسک قورس و نەگبەت. (٧) سمنج: لەنج باز، لەجووج. (٨) چنگداران: دڕندەکان. (٩) چەش: ورچ بە زاراوەی هەورامی و (گۆران). (١٠) (ضەرب مەسەل)ێکی کوردییە کە: لە حـەیبـەتی ئاورا پەنای بە ئاو برد چونکە خنکان لە ئاوا ئاسانترە لە سووتان لەناو ئاوردا. (١١) عێلجاڕی: گەلەکۆمە. (١٢) زیانەخرو، زەرەردەر، زیانبەخش. (١٣) مەندەر: هەڵوێست، سەبرکردن لە کارێ بە ئامانەت. (١٤) پشوو بگرێ: ماندووی دەرکا، ئیسراحەت کا. (١٥) هەموار: تەحەمول. (١٦) هاتنە سەر پاشوو بەو حاڵەتە ئەڵێن کە چوار پێی مەغروور شاخ ئەکا و هەڵئەسێتە سەر پاشووی. (١٧) دەغەڵ: بەدپێست و ئەخلاقسز و حەیاسز. (١٨) چاپلووسی: خۆشەویستکردن. (١٩) زەڕ: زێڕ، ئاڵتوون. (٢٠) داوەر: حـەکـەم. (٢١) کـتکە نەوتینە: بە ئەندامی شـەڕ هەڵخـڕین ئەڵێن. ئەویش لەبەرئەوەیە لە کۆنا کاتێ بییانویستایێ شوێنی ئاور بدەن پەڕۆی نەوتاوییان ئەپێچا لە پشیلەیێ و وێڵیان ئەکرد ئەویش لەترسی گیانی دەرئەچوو، وە دەوروبەری خۆی ئاورئەدا. (٢٢) خێرئەندێش: خەیرخواە. (٢٣) پەپوولەزەڕبدە: نەوعی پەپوولە هەیە منداڵ دەستی پێوە ئەدا و ئەڵێ: پەپوولە زەڕ بدە! کە پەپوولەکە وێڵ ئەکا بڕێ زەرق بەرق بەپەنجەیەوە ئەمێنێ. (٢٤) کەس کوا ئارەزووی زەڕ کا: کەس کوا مەبەستێکی ماددیی هەبێ و پارەی بوێ؟ (٢٥) چەمووش: بەدجینس و شەڕانی. (٢٦) ئیعلامی: ئیینتیقام و موجازات و تەمێ - کەیفەر. (٢٧) قاو: بانگ. (٢٨) چەپۆکان، هەڵخستنەوە و لەپ بەعەرزادانی چوارپێی مەغروور. (٢٩) چەمووش بازی: شەڕفرۆشی و بەدجینسی. (٣٠) چەپ و گوپ: گەڕوگوڕ. (٣١) پشتگوێ خستن: ئیعتنایێ نەکردن. (٣٢) غەرەز کوشتارە: هەدەف کوشتنە.

له مەیخانەی دڵا تاوێ دەگرییێم، ساتێ خەندانم
بەپێی ئایینی سەودا بێ قەرار و مەست و حەیرانم
زەمامی بیر و تەدبیرم سپاردە دەستی سەرمەستی
له ڕەمزی مەنطیقی تەرتیبی هەستی هیچێ نازانم
له جەمخانەی جەفا، گیرۆدەیی ناز یا، وەفا گیربم
له کوێ فەرقی هەیە؟ لەمیان، وەکو ئەویان هەراسانم
له دەریای بێ پەڕی ڕازی هەوادا، کاتێ خنکابم
فلانی! کەی ڕەوایە پێم بلێن غەوواصی دەورانم؟
تەنت دەردا بە سەودایێ، لەپێناویا سەر وماڵت
گرەوگانە لەڕێیا، سەهلە دایاننێی بە ویجدانم
لەکوێ نابار و بێ بڕوا و سەهەندە و ڕایی ڕایی بووم؟
کە زۆرم بۆ بهێنن زوو، سپەرخەم، بۆ ڕەقیبانم
قوڕی تاپۆ و گراڵەی خۆشەویستیم زوو بە ئەشکی ئاڵ
کە شێلا کوا ئەوەم تیاهێشتەوە بێژن پەشیمانم
لەسەر داخوازی دێرینم ئەڕۆم تا تین لە تەندا بێ
وەفاکێش و، صەفا ئایین و، دڵسۆزی دڵستانم
ترازووی عەدلی داوەر، سەر ئەکا بێژێ ئەگونجێ من
له ڕێ لادەم کەمێ داساکێ سۆز و جۆشی گریانم
لەکوێ (هێژا) ئەگونجێ داد و قاڵی تاوێ دامرکێ
گڕو گڵپە و بڵێسەی دڵ دەسووتێنێ بە ئیمانم





شین و زاریی، پیر و مەستانی هەوا[١] ناچارییە
ئاهی سەردە و، سۆزی داغە و، ئەشکی ئاڵی جارییە
وای لە ڕازانی نەوای شۆریدە حاڵی داغدار
دڵتەزێن و شێر ڕمێن و، لاو بەزێن و کارییە
ناڵە ناڵ و داد و قاڵی بێ وچانی دڵ برین
خەستە گروێن[٢] و جیگەر تاوێن و شین و زارییە
گەرمیی ئایینی نەوای نەرمی نەوازشکاری[٣] پیر
شەرحی حاڵی گیانفیدایی و مەدرەسەی دڵدارییە
قەیس و لەیلای مەکتەبی ڕۆح و مەرامی «زین و مەم»
زینەت ئارای شانی شانۆی مەیکەدەی عەییارییە
هەلهەلەی غیلمان و حووری دەستەیی کۆڕی خەراب[٤]
وەلوەلەی بەزمی صەفا و ئاهەنگی هاریکارییە
دەستە، دەستە، حوور و غیلمان و پەری دێن و دەچن
دەس بە مینا و، لێو بە جامی جەم، سەما و، مەیخوارییە
بانگی ئازادی ئەدەن ئازادەگانی کۆنەکار
زەمزەمەی نەوباوەگان[٥] ساز و نەوای ڕزگارییە
کامگار[٦] و «کام ڕەوا»ی سەرمەستی پەیکی خۆش خەرام
ساز و سۆزی موطریبانی خۆش نەوای غەمخوارییە
هاودڵ و هاوڕاز و هام دەمسازی بەزمی دڵنەواز
ڕازی مەستانی دڵ ئاگای مەسلەکی بێدارییە
ویردی ڕزگاریی دڵی (هێژا)یە دڵسۆزی بەسۆز
ڕستگاران شەرح ئەدەن کارایی[٧] ئەو هاوکارییە

(١) هەوا: مەرام. (٢) گروێن: گروون، پرواندن و پێست گرتنەوە. (٣) نەوازش: مەحەبەت. (٤) خەراب: مەست. (٥) نەوباوە: تازە پێگەیشتوو. (٦) کامگار: بەمرادگەیشتوو. (٧) کارایی: لێهاتوویی، تەوانایی.

## خەیاڵی خاو

هەتا کەی ناتەوێ ناوم بهێنی
ئەگونجێ ڕاست و ڕووت تێمان گەیێنی؟!
لەبەر چی وا لە ناوی من دەتۆقی
بەزوانی جوانی خۆم بۆ نامدوێنی؟!
هەزار ساڵە کە «گۆتی»ت کردە «جوودی»
کە بەشکەم تۆمی خۆتی پیا وەشێنی
کەچی لالەی ڕواند هەر دۆڵ و شیوی
پتوورکاندی ئەوەی تۆ تیا ئەچێنی
طەبیعەت کوا دەگۆڕدرێ، کەچ سەلیقە!
دە عەیبە سەعیە کەی خۆت داسەپێنی
وەڵاتی کوردەواری ناتپەزێرێ[1]
ئیتر با بەس بێ، کەم بڕژێنە خوێنی
لە گێتی کەس نەما نەیکەیتە هاودەس
نەما مەکرێ نەکۆشی دایوەشێنی
هەمووت سەر تێکوتا، عەیبە نەفامی!
کە پێش ناچێ، بەسە! خۆت ئەخلەتێنی
چ چل ملیۆن نفووس لەکوێ دەفەوتێ
دە ماڵوێران بەسە، کەی واز ئەهێنێ؟
ئەوەی تۆ ئەیکەی ئینکاری هەتاوە[2]
خەیاڵی خاوە[3]، تێیدا، دادەمێنی
کەلوپووری[4] گەلێ پێشینە ڕووناک
دزین ئاسان نییە! بۆ کوێر ئەخوێنی؟[5]
چلۆن مێژووی وەڵاتێ کۆن و مەشهوور
بە چاوبەس[6] تێکئەدەی کۆز و کەلێنی



بەسە، پڕ ڕوویی، نەنگە، جەردەیی دوون!
بە ئاسان گەنجی خەڵکی نارفێنی!
جیهانی ئەمڕۆ ئاگادار و، وریان
قەبووڵ ناکرێ غەڵەت تێیانگەیێنی
سەرئەنجام دێتەوە ڕێت کردگارت
وەهات لێ دێ کە «بەمبوول»[7] دەرنەهێنی
پەشیمانی بە داخۆ کارێ ناکات
لە پارە و لالە هیچ هەڵناکڕێنی
حەقی حەقدار ئەچێتۆ دەستی خێوی
لەوێ مەیدان نییە، لووت هەڵخولێنی[8]
ئەبێتە بەرپەڵی دەستیار و دوژمن
لە لووتت دێتەوە خوێنبایی خوێنی
وەرە پێشبینی (هێژا)ت چاک لە بیر بێ
کە بێ شک دێتەدی ڕازی نهێنی

(١) ناتپەزێرێ: قەبووڵت ناکا. (٢) ئینکاری هەتاو: ئینکاری بەدیهی. (٣) خەیاڵی خاو: خەیاڵی بێ جێ. (٤) کەلوپوور: ئیرث. (٥) کوێر خوێندن: بینینی غەڵەت. (٦) چاوبەس: نەیرەنگ و فەریب. (٧) بەمبوول: دەبەدەرهێنان، گزنی کردن. (٨) لووت هەڵخولاندن: بێ ئیعتینایی.

## ئاوێنەی ئەوین

لەسەر کەیفم، برایان! گەرمە سەودام
کەسێ چووزانێ چەندێ جوانە هیوام
چلۆن بە زمان ئەوترێ حاڵەتی من
مەگەر گیرۆدە، سەر دەرکا، لە هەڵڵام
لەکوێ ڕوئیای، بەهەشتی نەشئەیی ژین
بە دەم وێژراوە، شەرحی شۆر و غەوغام
نەما هاوڕاز و هاودەردێ نەزانێ
لە خومخانەی مەبەستا بۆچی ڕیسوام
ئەوی وا ئاشکرا و مەشهووری عامە
لە بێگانە و بەڵەد، ڕووناکە، شەیدام
بەڵام کوا، کێ ئەزانێ، بووکی ئاوات
چ نازێکە، فریشتەی جوانی ڕوئیام
لە خۆڕایی نییە وا یەک لەسەر یەک
پەیاپەی مەی ئەنۆشم، جام لەسەر جام
نەوای ئاهەنگی گەرمی شەوق و زەوقم
بەرەو کۆڕی سەما ڕائەبڕێ سەرسام
ئەگەرچی جامی ساقیی کەیلەکەی من
لە خومرەی ئەو پڕ ئەکرێ جامی صەهبام
لە ئاوێنەی ئەوینا جاروبارێ
ڕوو ئەنوێنێ بوتی عەییاری ڕەعنام
لە مینا و جامی صافی پەیکی ڕازا
گڕ ئەگرێ ئاهی داغی کڵپە ئاسام
لەپڕ تا سەیر ئەکەم، وا ڕەم ئەکا لێم
چمان ئاوات بوو، خەو بوو، شکڵی لەیلام



بەڵام لە خوام ئەوێ ڕۆڵە و نەوەی من
وەکو ئێمە نەبن ڕەنجوور و ناکام
من و ئەمثالی من (هێژا)! هەموو چوون
لەپێناوی هەوایا، بێ سەرئەنجام

## نەرگسی شەهلا

کە شنیا سروەی ئەمڕۆ بای بەیانی
بەلێوی غونچە تارای گرت، دڕانی
لە حیجلەی هاتەدەر تاراجگەری دڵ
بە نازۆ بۆ چەمەن تەشریفی هانی
ئەوی گوڵ بوو لە باغچەی بەرسەرادا
لە ڕەنگ گۆڕیان و ئاوڕەنگیان خەزانی
پەڕەی لوول بوو خوماری مەستی شەهلا
بە غەمزەی نەرگسی جادووگەرانی
شەقایق هەڵوەری، لالە شەقی برد
لەئالّیی لەعلی لێو و، کولّمی جوانی
خەجالّەتبار لە بالای سەرووی ئازاد
کە شەمشادیش چرۆی سیسا و وەرانی
کەناری و فاختە، قومری و بولبول ئاواز
کە پێچیا ناو چەمەن سۆزی ئەغانی
چەم و خەم بوو لە بەر پەرژینی باغا
خومار بوو پاسەوان، مەس باغەبانی
گوڵ و دڵ، دلبەر و دڵباختە «فاختە»
دەبەنگ حەس حەس، خەوالّوو پاسەوانی
لەوێ سەرجەم خەراب و مەست و ئازاد
سەما و ڕەقص ونەوازیش، میهرەبانی
ڕەواجی بەزم و ئاهەنگ و بیساتە
نەوا و بەستە و غەزەل، ئاوازە خوانی
دڵ ئازاری و غەم و حوزن و حەسەد کوا
لە خێڵخانەی صەفان مەطروود و فانی



فیدای بەزمی مەحەببەت بم کە لەویا
فەرامۆشە غەمی گێتی و فوغانی
ئەمیر و شێخ و دارا و ئاغە یەکسان
فەقیر و بێنەوا و سەردار و خانی
هەموو جامیان لە خومرەی ساقی کەیلە
هەموو یەکدڵ وەکو یەک یاری گیانی
عەجەب کەیفێکە (هێژا) سەیری گوڵزار
بە دڵ موشتاقی ئەو بەزمەم فڵانی

## بزووسکێ

دڵی دۆس مەڕەنجێنە، ئازار ببینێ
مەحاڵە کە ڕەنجا، لەکن یار بمێنێ
ڕەمی کرد و، تارانت و، تۆرا و، ڕەواندت
یەقین باجی تاران، لە تووران ئەسێنێ
لە عیشقا بزووسکێکی مایەی حەیاتە
ئەگونجێ، «ڕەزێ» ڕازی پێ هەڵگرێنێ
خەتەرناکە سازان و سووتانی سەودا
نەریمان لە سامناکیی، سەرسام ئەمێنێ
مەڕەنجێنە ئوستادی کار کوشتە بەڵکوو
لە بورجی «ئەوین» دڵنەواز هەڵبەزێنێ
مەزن چارەجۆ، مەردی کارزانی دەیر
لە باغچەی خەراباتی مەی «مێو»، ئەچێنێ
چ بەزمێکە بازاڕی سەودا فرۆشتن
کەسێ کوا لە سامی سەری سڕ نەمێنێ
چ دڵگیرە دڵباز و دلبەر دواندن
خەراجی دو کیشوەر، بە غەمزە ئەسێنێ
ئەگەر ڕازی (هێژا)ی مەحەبەت نەبووبا
لەکوێ ساز دەبوو دوو بە یەک دەربهێنێ



## کەمەندی یار گیر

کە تۆ یاری دڵی شەیدای، لە گێتی و خەڵکی چیت داوە[١]
دڵم لەو ڕۆژەوە، تۆی دی، لە عالەم وازی هێناوە
کەمەندی زڵفی یار گیرت، لە دەوری گەردەنم ئاڵا
ئیتر چیی دیت[٢] ئەوێ کاتێ، دڵم لای تۆ بەجێماوە
لە سەیری گوڵشەنی گێتی و لە گەشتی سەرسەراوم چی
لەپێناوی مەحەببەتدا، دڵ و گیانم بە تۆ داوە
مەڵێن سەرسام و داماوە چلۆن حاڵم لەسەرخۆ بێ؟
دڵ و ڕۆحم گرەوگانە[٣]، بەلای دڵخوازی ڕەعناوە
بەچەشنێ نوقمی عیشقی دلستانی جوانی غەددارم
لە عالەم پەرتم و حەیران و، نازانم چ قەوماوە
بەڵام لەولاوە سەیری شۆڕش و غەوغا و قیامەتتکە
کە ساقی و، موطریب و، حوورو، پەری، دێن دەس بە صەهباوە
لە جەرگەی بەزمی مەستان، دەس بە جام و شاد و خەندانم
بەسەر تەختی ئەوینۆ دڵنیام و، خوم نەشێویاوە
ڕەفیق! تۆ کوا ئەزانی دەوری جەمگای جەم چ بەزمێکە
لەوێ ڕووخاوە قەلعەی غەم، خەفەت بەربادە، فەوتاوە
بڵێن سەوداگەرانی غەم، لەلای من کۆوەبن سەرجەم
کە پێیان موژدە دەم دارووی دەروونی خەستە ناسراوە
ئەوین و، خۆشەویستی و، مەستیی و، لێبوردن و، بڕوا
لە خومخانەی خەما، تێکەڵ کە بوو، نۆشداروی[٤] ناوە
ئەوی (هێژا) بێ تیماری، هەموو دەردێکی ئاسانە
خەیاڵی تەختە[٥]، یەکڕەنگە، دڵی هەرگیز نەگۆڕاوە

(١) لە خەڵکی گێتی چیت داوە: چیتە بەسەر خەڵکی دنیاوە. (٢) چیی دیت ئەوێ: چیی ترت گەرەکە. (٣) گرەوگانە: مەرهوونە، لە ڕەهنایە. (٤) نۆشداروو: دەوای گشت دەردێ، ئیسمێکی موڕەککەبی فارسی و کوردییە کە: نۆش، صیحەت یا شیفا و داروو: دەرمان واتە دارووی صیحەت. (٥) خەیاڵی تەختە، یا دڵی تەختە، واتە دڵنیایە و دڵە کورکێی نییە.

## چیی تیا بەستەیە

ئەو هەموو ناز و ئەدا و ئەتوارە چیی تیا بەستەیە؟
چۆن درووس ئەکرێ گەلێ لاساری[1] تیا سەردەستەیە
بێ خەبەر پێی وایە هەرچی مەیلی لێیە هەر دەبێ
جەبری تەقدیری بەلاوە، ئەمری کوێخا وەیسەیە
نایەوێ قەت تێ بگا خواجە و، ئەمیر و، شەهریار
گشتی بازیچەی زەمانە و هاتوچووی پەیوەستەیە[2]
ناز ئەکا، لای وایە تاڵووکەی زەمان ئەو ناچەشێ
غافڵە بازیچەیی گەردوونی دوون بەرجەستەیە[3]
زۆر وەکو ئەو، لائوبالی[4] بوون، بەخۆخەڕە[5] و قەوی
بەر پلاری کەوتن و چوون، بێ ثەمەر ئەو دەستەیە
هەر کە دەسخۆشی هەوای[6] بێ ڕەویە بوو کەڵکی نییە
زۆر گرانە کەچڕەوێ بێ، وەرگەڕی لەو ڕەستەیە[7]
کاری تێ ناکا تکا و، ئەندەرز و، پەند و، سەرزەنش
قاپی ئاوەزیان کپە و، دالآنی دڵیان بەستەیە
چاری کوانێ کەچڕەوی گوێ ئاخنیوی خۆپەرست
هەر کە عەقڵی سووکە، تێفکرینی لەنگ و خەستەیە
ڕۆح کە بیمار بوو بەڕاستی، چاری سەبری پێ دەوێ
بێ نەوا موحتاجی دڵسۆز و برای شایستەیە
دوو دڵم لەو تیپە، لێم مەگرن، دەترسێم، چونکە خۆی
دوودڵی و ترسان، لە پەت، ئایینی ماران گەیستەیە[8]
یاری (هێژا)ی پێ دەوێ و حیکمەت شیعاری ژیر و مەند[9]
ڕاستەکەی کاری دڵ ئاگاییێکی زۆر بەرجەستەیە

---

(١) لاسار: لەنج باز، لەجووج. (٢) پەیوەستە: موتتەصیل: یەک لە شوێن یەک. (٣) بەرجەستە: ەڵکەوتوو. (٤) لائوبالی: بێ موبالات و گوێ نەدەر، بێ بەندوبار و بێ دەربەس. (٥) بەخۆخەڕە:



خودپەسەند، خودخواە، خۆپەرست. (٦) دەسخۆشی هەوا: مەغروور، مەحکوومی هەوا و ئارەزووی خۆی. وشەی «دەسخۆش» لە فارسی و کوردیدا، پێش هەر صیفەتێ کەوت مەعنای ئەوەیە کە مەحکوومی ئەو صیفەتەیە: دەسخۆشی ترس: ترسنۆک. (٧) ڕەستە: ڕیز، تیپ، تاقم، خط مشی. (٨) مەتەڵێکی کوردی ئەڵێ: «ماران گەستە لە گوریسی ڕەش و سپی ئەترسێ» ترسان لە پەت و گوریس: ڕەسمی ماران گازەکانە. (٩) مەند: ئارام و لەسەرخۆ.

## بەخێڵ

به تەشـــەر چاوەیی چاوی هونەرم لیێڵ مـــەکـــە
تیـری ویجـدانی نەخـۆشت بە جـەفـا ، وێڵ مـەکـە
کـشـتـوکـاڵت کـە هەمـوو پەیکوڵ و دڕک و داڵە
بێ لە مەزرای کەسی تر دەس مەدە، لاکێڵ[1] مەکە
دە لە کـولبـەی پەسی خـۆت داکـەوە بەس بێ ئیـتـر
شەڕ و گەڕ ئاوقەدی[2] سادەی گەڕەک و خێڵ مەکە
تۆ کـە بیـمـاری عـیـلاجی شـەڕ و شـۆڕت نایێ
مـەردی خـوا بە! لە گـرۆی سـادە فـڕ و فـێڵ مـەکـە
دە لە خـەڵکێ گـەڕێ، سەیری ئەم و ئەو کەن یەکدڵ
لە جەفـا و دوودڵی بۆ سـادە دڵان «مـێڵ»[3] مـەکـە
کـــەر و گـــاجـــووتی هەژار بۆ بەدەس هێنانی دراو
هاومل و ئاوقەدی جووت نێڵە لەسەر پێڵ[4] مەکە
عـــەینی باغـــاتی بەهەشـــتـــە کـەژ و کـێـو و ئاوم
دە بە ویجدانێ کە نەتبوو کەس ئەراگـێڵ[5] مەکە
تۆ بە مـەردت کـە نەوێراوە، لـە «بەق»[6] ترسـاوی
دە بە ناپیاوی شەڕاشۆیی لەگەڵ «چێڵ»[7] مـەکـە
ناتپـــەزێرێ ئەوی «هێـــژا» بێ لە کـــوڕی خـــۆیا
زایلــەی لاڵە و پاڕەت بە درۆ زێڵ[8] مـــەکـــە!

---

(١) لاکێڵ: بەو فەلایە ئەڵێن لە عەرزی فەلاییێکی ترا بەبێ قەراردادی بەینی خۆیان فەلاحەت بکات.
(٢) ئاوقـەد: دوچار. (٣) مـێڵ: بەو مـێـڵـە ئەڵێن کـە چاوی پێ ئەڕەژن. (٤) بەرزیی پشت مل، بەتایبەت پشت ملی گـا: پێڵ. (٥) ئەراگـێڵ: وەیلان و دەربەدەر. (٦) بەق: نێرەکەو. (٧) چێڵ: ماکەو. (٨) زێڵ: پێچەوانەی بەم، دەنگی باریک و تیژ.



## غەم مەخۆ

وەرگێڕاوی غەزەلێکی خواجە حافظی شیرازییە

یووسـفی نایاب بەرەو کـەنعـان ئەبێـتـۆ، غـەم مـەخـۆ
کـووخی غـەم ئەڕوێنێ دیسـانۆ گـوڵسـتـان غـەم مـەخـۆ
دڵنیـــا بە ئەم دڵە غـــەمگینە حـــاڵی دێتـــە جێ
ئەم سـەرە پڕ شۆرە، هەر ئەگرێتۆ سـامـان، غـەم مـەخـۆ
ئـەر بەهـاری ژینـێ دووبارەی هەبێ بـەزمی چەمـــەن
هەڵدەبێتو چەتری گوڵ، باڵداری خۆشخوان، غەم مەخۆ
هەڵخـــولانی گـــۆیی گـــەردانمان نەبوو ڕۆژێ بە مـــەیل
کوا گـەڕا چەندێ بەیەکسـان چەرخی دەوران، غەم مـەخۆ
تۆ کـە نائاگـای لە سـیـڕڕی غـەیبی نەومـیـدیت لەچی!
با لەپشـتی پەردە گـوم بێ ڕازی پەنهـان، غـەم مـەخـۆ
ئەی دڵ ئەر لافـاوی نیـسـتی بنجی هەسـتی هەڵکەنێ
چونکە کەشتیوانی طووفـان، نووحە، ئامان غـەم مەخۆ
گەرچی ڕێگا پڕ مەترسی و مەنزڵیش زۆر دوور بێ لێت
کـوانێ شـارێ یێ نەگـاتە بێخ و پایان، غـەم مـەخـۆ
حـاڵی ئێـمـە زار لە دووریی یار و گـۆشت تاڵیی ڕەقیب
گشت ئەزانن چەپگەڕە گـەردوونی گـەردان، غـەم مـەخـۆ
(حـافظ) و (هێـژا) لە کـونجی خـەڵوەتا و شـێـوانی تار
تاکـە یارت هەر دوعـایە و دەرسی قـورئان، غـەم مـەخـۆ

وەرگێڕانی غەزەلێکی خواجە (حافظ)ی شیرازییە

گولی رووی لە گولستانی جەهان بەسمانە
لە چەمەن سێبەری سەروێکی ڕەوان، بەسمانە
من و هاوڕازی لەگەڵ ئەهلی ڕییا ناجۆرە
لە گران سەنگ جەهان، مشتێ گران[1] بەسمانە
کۆشکی فیردەوسی[2] لەبەر کردەوەیە بەخشینی
ئێمە چون ڕێند و گەداین، دەیری موغان بەسمانە
لە کەنار جۆگەیێ سەیری گوزەری عومرێکە
ئەو نموونە لە ژیانی گوزەران[3]، بەسمانە
نەقدی بازاڕی جیهان سەیرە لەگەڵ ئازاری
لای تۆ سوود و زەرەری کەم بوو، بەڵام بەسمانە
یار لەگەڵ ئێمەیە ئیتر لەوە زیاتر چیم بێ
دەوڵەتی هاتنی ئەو، قووتی ڕەوان، بەسمانە
قاپیەوانیم بەسە، مەمنێرە بەهەشت ئەی خالیق
لەم جیهانە بەری دەرگاهی ئەمان[4] بەسمانە
مالیخۆلیای[5] سەرە وەصل و شەرەفی بەخشینت
سوودی سەودایە[6] لە کاڵای دوو جیهان بەسمانە
حافظ! ئەو ڕەویەیی تەقسیمە گلەی پێ ناوێ
مرخێ[7] (هێژا) و غەزەلی جوان و ڕەوان بەسمانە

(١) مشتێ گران: میقدارێکی کەم بەڵام بایبدار و گران نە هەرزان. (٢) فیردەوسی: بەهەشتی.
(٣) گوزەران: سەریع السیر. ئەو ژینەی بەپەلە ئەڕوا. (٤) دەرگاهی ئەمان: بەرقاپیی ئیطمینان.
(٥) مالیخۆلیا: خدێی سەر، مەراقی سەر. (٦) سوودی سەودا: قازانجی موعامەلەی دنیا و قیامەت.
(٧) مرخ: ذەوق، طەبع.





وەرگێڕاوی غەزەلێکی خواجە «حافظ»ی شیرازییە

ئاشکرا ئێژم و لەو واتەیەشم دڵشادم
بەندەیی عیشقم و لەم عالەم و لەو[1] ئازادم
مەلی قودسیم و چلۆن لێکدەمۆ دەردی دووری[2]
چ بڵێم چۆنە! کە لەم داوە، وەها بەربادم
من مەلەک بووم و لە فیردەوسی بەریندا ئەژیام
ئادەم هێنامی کە وەیلانی خەراب ئابادم[3]
سێبەری «طوبی»[4] و نازی پەری، هێنای[5] حەوضی
بە هەوای ئۆینی دۆس، ڕۆیی لە فیکر و یادم
غەیری ئەلفی قەدی[6]، لەوحی دڵی من شەقڵی کرا
چی بکەم، چیی دیی نەوت پێم لە حرووف[7] ئوستادم
بەختی چی؟ کوانێ نجوومگەر لە ستارەی زانیم
داکی گێتی بە چ شانسێ منی بوو؟ چی زادم[8]؟
تا لە گوێما خەمی[9] ئەڵقەی خومی عیشقم دەرکەوت
هات غەمی تازە پەیاپەی بۆ (مبارەکباد)م
خوێنی ئەم دڵمە ئەخوا مەردومەکی[10] چاو و ئەڵێ
بۆ دڵم دا بە جیگەرگۆشەیی خەڵکیم، نادم
پاک کەنۆ ڕوومەتی (حافظ) بە دەسە زڵف لە ئەشک
وەرنە لافاوی پەیاپەی[11] پەی ئەکا[12] بونیادم[13]
سەیری هێژاکە جەسوورە لە ئەدەبدا، بۆیە
هەڵئەگێڕێتۆ بە کوردی غەزەلی ئوستادم

(١) لەم عالەم و لەو: لەم دونیا و لەو دونیا، دنیا و قیامەت. (٢) دووری: مەبەستی پێ دوورکەوتنەوە لە عالەمی قودسە. (٣) خەراب ئاباد: لەلایەک مەبەستی دونیایە، لە لایەکیتر مەبەستی

دونیای عیش و مەستییە. (٤) طوبی: درەختێکی بەناوبانگی بەهەشتیە. (٥) هێنا: شنۆی حەوضی کەوثەر. ئۆین: مەکر و سیاسەت. (٦) ئەلفی قەد: بالآی وەکو ئەلف ڕێکوپێک. (٧) مەبەستی پێ ئەوەیە کە غەیری قەد و قامەتی تۆ کە وەک ئەلف واتە، ئوستادم غەیری قەد و بالآی مەوزوونت حەرفێکی تری بە من نەوت. (٨) چی زادم: هێمان نازانم ئادەمیزادم، پەریم، چیم؟ (٩) خەمی ئەڵقەی خومی عیشق: ئەڵقەی غولآمی عیشق و مەستی. (١٠) مەردومەک: بیلبیلە لە گلێنەی چاوا دیارە مەردومەکی پێ ئەڵێن. (١١) پەیاپەی: یەک لەدوای یەک. (١٢) پەیکردن: لە بیخا بڕین. (١٣) بونیاد: ئەساس و ڕیشەی هەر شتێ.



## ئازادە

وەرگێڕاوی غەزەلێکی «حافظ»ی شیرازییە

زڵفی خاوت مەدە بەر با، کە نەدەی بەربادم
گیانە نازاری مەکە و مەبڕە لە بن بونیادم
مەی مەنۆشە، لەگەڵ هەر کەس کە نەخۆمۆ خوێناو
سەرکەشی بکەی، فەلەک ئەیبیسێ نەوای فەریادم
حەڵقەی ئەو زڵفە مەهاوە، کە لەپڕ بەندم کەی
بامەدە پەلکەیی ڕەش، تاکو نەدەی بەربادم
یاری بێگانە مەبە، تاکە لە خود بێ خۆم کەی
غەمی ئەغیار مەخۆ، تاکو نەکەی ناشادم
ڕوویێ بنوێنە! گوڵ و بەرگی گوڵم بیر چێتۆ
قەدێ ئالآ کە، کە بەرتر بێ، لە سەد شەمشادم
مەبە شەمعی هەموو جەمعێک و، بمانسووتێنی
بیری هیچ خزمێ مەکە، پەرتی بکا لێت یادم
مەبەرە شۆرەیی شار و، لە غەما کێویم کەی
شۆری شیرین، مەپەزێرە و، مەڵێ من فەرهادم
بەزەییت بێ بە هەژاریم و، بە فەریادمۆ بێ
تا بە خاکی دەری ئاصەف، نەگەیێ بێدارم
کێ لەجەوری تۆ هەراسانە! دە حاشا (حافظ)!
منی (هێژا) شەرەفی بەندتم هەبێ، ئازادم

## تاڵووكەی ژین

شاپەڕی ئەفكاری ژاكان باڕەشی ئاهی دەروون
كاتێ گیفانی لە دەریای بوونەوە چوو بۆ نەبوون
دیق دڵیی زۆر بوو مەلی ڕۆحم بەدەس بێ ڕەوحەوە
بۆیە ئاسان خۆی بەدەم ئەو باوە دا بێ چەند و چوون
ژین پڕی دەردی سەر و ژانی دڵ و تاڵووكە بێ
تامی كوانێ پیاو بژی داماو و بێكارە و زەبوون
خۆشە ئازاد و، كەڵ و، سەربەست و، بێ وەرهەم بژیت
كوا ئەزانێ لەذەتی وا ژینێ پەتیارە و چەتوون
پیاوەتی و، ویجدان و، ئینصاف و، شەرەف، ئاسان نییە
ڕەنجی زۆریان دا بەدوویا، مەرد و، ژیر و، ڕەهنموون
تا گەلێ هۆشیار و، بێدار و، بزەن، ئامادە كەن
بۆ بەرەنگاریی ئەوانەی هەرزەوو بێ ئابڕوون
داخەكەم ئەكشەر بە داخی خەڵكۆ سەریان نایەوە
قارەمانانی گەل و دونیاو و دین و فیكری ڕوون
خۆفرۆشانی دژی ئازادیی و بێ بەند و بار
قەت نەیانفامی لەگەڵ تاڵووكەیی ژین ڕووبەڕوون
خوڵكو خووی ناباب و ڕەفتاری كەچی یاغی و دەغەڵ
هانیدا گیانم بڵێ: «إنا إلیه راجعون»
تاكو ڕزگار بێ لە نەنگی ڕۆژگار و بسرەوێ
دوو دەسی پێشكەش بكا دونیای دەنی بۆ خێڵی دوون
ڕەحمەتی، «هێژا»ی ئەدیبی پڕ تەوان هەر زوو وتی:
كوانێ پارێزرا شەرەف تا باش نەیانڕەشتۆ بە هوون[1]

---

(١) لەسەر بناغەی بەیتێكی عەرەبی وتراوە كە ئەڵێ: «لایسلم الشرَّف الرَّفیع من الاذی: حتی یُراقَ علی جوانبها الدَّمُ»

# تەواوی گۆرانییەکان

واتە ئەوانەی لام مابوون، لەم بەشەدا کۆکراونەتەوە

## عاشقی زار

تەنکە، ناسکۆڵەی باڵا بەرز!
ئێسک سووک: بامەزەی خۆش تەرز!
تەڕلانی بەرزە ئێلاخان
سەهەن پەروەردە، کیژی جوان!
لایێ کەرۆ لەم هەژارە
بە عەشقی تۆ گرفتارە

***

نازداری نازت ئەکێشم
فەرموو ئەوا دڵی ڕێشم!
چیت ئەوێ سەر بە فەرمانم
ئەمر کە! ئارامی گیانم
فیداییت عاشقێ زارە
بە عەشقی تۆ گرفتارە

***

ئەی شۆخەکەی دڵ ئاوێزم!
ئەی دڵڕوبای بێ پارێزم
خۆت ئەزانی کە وێرانم
لە جوانیت مات و حەیرانم
ویردی زووانم هەر یارە
کەللەی سەحەر تا ئێوارە

***

ئەو ئیستیغنا ئیتر زۆرە
تەسلیم ڕەنجاندن ناجۆرە
سەری من و شمشێری تۆ



مەڵێ بۆچی؟ هەی ڕۆ! هەی ڕۆ!
برۆت شیر، زلفت قەنارە
بۆ خۆت بمدە لەو سێدارە

## سەرکەش

نەمامی گوڵزاری ژینم!
تێراو بە دانەی ئەسرینم!
غونچەم ڕەشتی، بە خوێنی گەش
خەملاندیتم بێ غەل و غەش
زەریف، خنجیلانە و ماوەش
نازدار و شیرین و دڵکەش
خۆشتەرز و شەنگوول و سەرکەش

***

نازەنین، دڵخوازی خۆمە
سەرباشقەی ئێران و ڕۆمە
پاراستوومە بە ڕۆح و گیان
پێم باختووە ڕۆح و ڕەوان
گشت بزانن پیر و جەوان
فیدایيم نام دا بە هەرزان
قەدرم دەزانێ میهرەبان

***

ڕەقیب ئەبێ دی واز بێنێ
دەردی دڵم نەدێوێنێ
ئەگەر خۆیشی بخنکێنێ
هەر ماندوویی پێ دەمێنێ
عیشقم داغ و ئاورینە
دەسهاتی سەرپاکی ژینە
نەمامی کۆرپەی ئەوینە



## سەوزە

سەوزە، هەی سەوزە، سەوزەکەی عەمرم!
تاقەتم بڕیا، تەواو بوو سەبرم
سەوزە! نەونەمام، ئاوەدانیی خێڵ
شکارچیی تەڕدەست سەحەر بوومەلێڵ
«کەحێلە و ڕەشکوێت»، باوبوران هەڵمەت
لایەق وە خۆتە سەوزەی بلیمەت
«لاچەناخ» زەنجیر، دڵ لەناو سینە
«پاشلغ» ئاوێتەی پەلکەی پڕچینە
ئەگریجەت لە دەور قورسی خۆر پەخشان
سەوزەم ئافەتی دڵ و دین و گیان
من وەیلان لە دووی زەردەخەنەی تۆ
هەردەگێڵ لە شوێن شنۆی لەنجەی تۆ
پەرێشانی تۆم سەوزەکەی عەمرم
تاقەتم تاقە، تەواوبوو سەبرم
بێرۆ بەرەو خێڵ با خۆم یارت بم
بە دڵ کێشکچیی دەور دەوارت بم

## ئەگریجەی لەیلا

پەروانەی ڕەقـقـاس، سـەرپەڕەی گـوڵـم
سـەمـای مـەوزوونە؟ یا پەڕەی دڵـم
ئەر بە شەوقی ذەوق گـوڵـی ڕەنگاوڕەنگ
وە جـەذبەی پەڕەی زەریف و قـەشـەنگ
پەڕەی دڵ وە یاد حـەڵقـەی لەعلی لێـو
شـەقـایق گـۆناو، وەنەوشـەی بان سـێـو
مـەجـذووبی نەشـئەی نەرگـسی شـەهلا
پابەند وە دامی ئەگـریجـەی لەیلا
کـام سـاز دڵگیـرە! کـام نەوا نەرمـە
کـام سـەما سـەودای سـۆزان و گـەرمە؟
داوەریـی دەعـوام دا وە ئەهـلـی دڵ
پسـپـۆڕانـی ڕاز ئاگـاهانی چڵ
سـەمـایێ وە سـاز یاسـای زەمـاوەند
یەکـێـتـر وە سـۆز دڵـی ڕێسـوای ڕەند
ئەویان بۆ خـەڵکی، ئەم جـەذبەی دڵـە
لەیەکـدان سـەودای وا دوور مـوشکڵـە



## خشڵ و خاو

من چۆن بتـوانم شـێـوەت تاریف کـەم
زمـان کـۆتام و نـاتەوان قـەڵـەم
کەچ کڵاو! «پێچە»ی مۆر، «چەتفە»ی «سورمە»
«تـارا»ی هـەورێـشم، باڵاپـۆش «تـورمـە»
«گـروون گـوڵحـۆقـە»ی قـیـمـەتی و «ئەتڵـەس»
لایـەق وە خـۆتـە شـۆخی دیدە مـەس
«لاچەناخ» ئاوێز دەوری سـینە و مـەم
«کـرمـەک»ت هونەر ڕێزەکـار عـەجـەم
«لاگـیـرە»ت لیـرەی سککەی عـوثمـانی
بەرسـەرەت پێـچکەی «غـازی»ی سـوڵتـانی
حەڵقەی «عـاشقبەند» «جـوققـە»ی «سینەڕێز»
دەسکار باش وەسـای «ئازەری»ی «تـەورێز»
«گـوواره» و «گـۆدەڵەک» ساختـەی «سلێمانی»
«بەرسـەرە»ی «مـوکـری» تەشکی سـۆرانی
«لوولـە و زەنجـیـر»ی چەپ و ڕاس لـەبان
«هەیاسە»ی زەریف «قـوپکە» و «گـۆ» پەخشـان
«لـەچـەک» تـۆڕداوی دڵانـی یـاخـی
«ئاوێزە»ی دەسکار خـانمی «سـابڵاخی»
«کـراس» پووڵەکـدۆز، زێبـای نازک کـار
کـیـژی تەڕدەسـتی «سلێـمـانی»ی نازدار
«ئەشـرەفی»ی ئاوێز «ئۆیە»ی «سـۆرانی»
«یاقـووت» پاڕیشـەی لەچکی «گـۆرانی»
«سـرکـەیی»ی یاسـای دەوری «دینەوەر»
خـالص ئەورێشم پێـچـەی دەوری سـەر

شیرین کار شێواز خانمی «گۆرانی»
یا «زەندی» شیراز توونای «توورانی»
یا «چەرداوڕی»ی یا کالاّی «کەڵهوڕ»
ئەمیرەی «ئیلام» ، شێرە ژنی «لوڕ»
یا «بویر ئەحمەدی» ، یا «بەختیاری»
سیما شایستەی سەودای سالاری
یەخە و فەقیانەی «ئاردەڵانی» کار
خانم «سنەیی» کارامە و عەییار
داوێن «سیمدۆز»ی بەین بەین «مرواری»
دەسکاری «سەقز» پاک «ڕێزەکاری»
«قۆڵەوانە»ی قۆڵ بەردی قیمەتی
«شەوە» و «لەعل» و «دوڕ» ناو زێڕی پەتی
«کلاوزەڕ» و «فێس» یاسای هەورامان
یادگاری کۆن خاتوونی ساسان
شەنگ و شۆخ، شیک پۆش، تەبار بابانی
ڕەشتەی سەرپەنجەی زیبای یەزدانی
«گوڵەنگ» ئاورێشم، ئاوێزان سێ چین
لە دەوری گەنجگای نەو نەمام پەرچین
«تاسکڵاو» هەولێر «بازووبەند» کۆیە
«پێشبەند» ئامێدی لایەق بە تۆیە
«دەسبەند» «مروا»ی «ئەڵماس» و «زمرووت»
«پیرۆزە» و «لەعل»ی قیمەتی و «یاقووت»
«کوڵەوان» زەڕی سیمکاری تەلاّ
شایستەی خۆتە سەد (بارک اللە)
«پیرۆزە»ی ئاوی پاچکەی «پامووره»
ئاوێزەی دەوری ساقی بلووره



«لاچاوە»ی نیگار نەقاشی بێچوون
لەتۆی «ئەگریجە» و بان «کوڵم»ی گوڵگوون
«دوگمە و دۆڵاو»ی «پیرۆزە» و «زمرووت»
«یەشم» و «عەقیق» و «چاوگوربە» و «یاقووت»
«پاشقەیتان، پشتبەند» ، «پشتەسەرە»ی زەڕ
«ژێر چەناکە»ی نەخش گەردەن مینای تەڕ
تۆی فریشتەی سان بەو گشت نازەوە
بە سیمای قەشەنگ قودرەت سازەوە
بەو دلڕوبایی و دام دڵگیرەوە
بەو لارولەنجەی بێ نەظیرەوە
چیت داوە ئازیز لەو خشڵ و خاوە
لە حەننای شێوەت جوانیی دۆڕاوە
سیپاڵ و خشڵ و خاو و ئارایش
لەچاو جوانیتا سووکە و ئالایش
خشڵ و خاوی جوان کوردانم ناوبرد
تا لە بیر نەچێ شیرینکاریی ورد
(هێژا)! تالانچی وان لەکەمینا!
تا دزیت لێ کەن لە پانای ژینا
ئەوەی تۆش وتت یەک لە هەزارە
مشتێ نموونەی هەزار خەروارە

## ئەڵماس

تیپێ کیژۆڵەی خۆش ئەندام، مووڕەش
با مەزە و خەندان، چاو ئەستێرەی گەش
دەم بەپێکەنین، خنجە و لەنجەولار
بەرەو سەرکانی لای دێ بەرەو خوار
هاو عومر و هاودەم، هاوئاوات و سۆز
شۆخ و شەنگ و جوان، شیک و لاو و قۆز
گۆرانی و چەپڵە و سەما و هەڵپەڕکێ
گا چنگەپڕچێ و ساتێ کێ وەرکێ
گەنجێکیان نازک خۆشخەندەرانێ
تەنکە و ڕەزا سووک، ئارامی گیانێ
مات بردبوویۆ کەس نەیدەزانی
ئاخۆ چ باس بێ ڕازی پەنهانی
دانەیێ فرمێسک ڕوونتر لە ئەڵماس
لەبەر پڕشنگی سەیر نەدەکرا خاس
بەسەر گۆنایۆ قەتیس دامابوو
هێندە زەریف بوو سەر لێی سڕ مابوو
پرسیم: ڕووحەکەم! چیت لێ قەوماوە؟
وتی: دڵخوازم دڵی گۆڕاوە.
جا دەردێ کوانێ ئەونە سەنگین بێ!
جا داخێ کوانێ هێند ئاورین بێ!
وتم بێچارە دڵی تۆراوە
کە تۆش پێت وایە ڕێگەی گۆڕاوە
یەخسیری ئەوین ڕزگاریی کوانێ
دێتەوە پا بۆس، عەفوی کە جوانێ!



مەلوول مەنیشە، بێرۆ بۆ ناو جەم
غەم بدە وە با چاوە ڕاسەکەم
بەخشش کردەوەی لاوی «هێژا»یە
دەرمانی تووناى مولکی سەودایە

## قیبلە قەزات لە من کەوێ

دڵم دایتێ، مەمڕەنجێنە
خۆشم دەوێی، مەمتۆرێنە
بورجی هیوام یەکجار بەرزە
حەیفە، گیانە، مەیڕووخێنە
هیی خۆتە وازی لێ بێنە

***

یاخوا قەزات لە من کەوێ
ئەوی نەیویستی نەسرەوێ
دەردی فیراقت ناڕەوێ
لە دووریی تۆ نانووم شەوێ
وێرانە دڵ، هەر تۆی دەوێ

***

لەلای ماڵان زەماوەنە
هەڵپەڕکێ و بەزم و گۆبەنە
کوڕ و کاڵ و گەنج وا جەحێڵ
کردوویانە بە فەرتەنە
سوڕنا و دەهۆڵ و نەی ژەنە

***

هەر من تەنیا و بێ دڵسۆزم
خەستە و بێزار و ئاڵۆزم
پەرێشانم، بێ دڵخوازم
بۆیە وا سۆزانە سۆزم
دەردەندووی هێلانە و کۆزم

***



پێم بگە ئارامی گیانم
ئێسک سووکی میهرەبانم
دووریی تۆ لانەی شێوانم
کە تۆم نەبێ سەرگەردانم
بێ دۆست و بێ دەزگیرانم

## ئاهووی ئێلاخان

ئاهووی ئێلاخان پێکەوتووی چاوڕەش!
سەر ئاسۆی بەرزان، سەرمەس، گەردەن کەش!
جەیران، جیرانکوژ، خوێنڕێژ، بێ دەربەس!
پەیکار مەینەت خێز بێ بڕەس بۆ کەس!
سەرپەنجە بە خوێن دڵبریاو ڕەشتە!
بێنەوا و گوڵگوون، شەلاڵە و کوشتە!
خوێنبایی عاشق هەژاریی هەردە
گوێ پێ نەدانە، یا مەیلێ سەردە
بە ناز و عیشوە ئەر جاروبارێ
لاکاتۆ ئەژی خەراجی شارێ
نازک نەو نەمام ئەو لەنجە و لارە!
ئافەتی گیان و ڕۆحی دڵدارە!
یەک زەردەخەنەت تیماری دەردە
بۆ دلبریاوی بێچارەی هەردە
قیبلەم! سەرعێلی خالخاسان گشتی
فریشتە وێنەی حۆریی بەهەشتی
سەبری پێویستە و دێر ئاشنایی
پارێز لە سامی سەودای شەیدایی



## تۆپی گوڵ

سەروی گوڵستانی دڵم
چرۆی نازاوی سەرچڵم
شیرینتر لە تۆپی گوڵم
غونچەی تەرانەی بولبولم
بۆت ئەخوێنم ئەتخاوێنم
لەتۆی دڵا ئەتلاوێنم

***

سینەم لانەی عەشقی تۆیە
ڕۆحم سەمەی مەشقی تۆیە
نەوام شۆڵەی شەوقی تۆیە
سەمام سەودای ذەوقی تۆیە
دەمسازی من، دڵخوازی من
هەر تۆم دەوێ هەمڕازی من

***

ئێستا ئێلاخ ڕەنگاوڕەنگە
پابنار کەسک و قەشەنگە
زوانم لە تاریفی لەنگە
پڕمەی بەران، زڕەی زەنگە
گوڵدەستەی من، توبێ گوڵم!
تاسەم کردووی، فێنکی دڵم!

***

شوانە شمشاڵەکەی سازە
«تەلوبەلی» دڵنەوازە
هەواش ئارامە مومتازە

هەنگامەی دڵ و دڵخوازە
چاوەڕێتن بێ ئەندازە
دۆستی کۆن و یاری تازە



## لە بەر نازی چاو بازان

گۆرانییێکی کۆنی کوردییە کە شیعرەکەی شاعیری تەوانای کوردی موکریان «وەفایی» گتوویەتی. بەڵام پێم وایە ئاهەنگەکەی وەکو زۆرێ لە گۆرانییەکانی ئەو سەردەمەی موکریان هیی «هەمزەبەگ» بێت. جا گۆرانی وێژە هونەرمەندەکانمان بەتایبەت کاک «مەزهەری خالەقی» کە دەنگی لە حەریر نەرمتر و ئاوای لە دەنگی بولبول گەرمترە، ویستی بیخوێنێ. منیش دوو پارچە هۆنراوەم دایێ کە یەکێکیان ئەم پارچەیە. بۆ ئەوەی ون نەبێت سەربەیتەکەی خۆشیم دووبارە کردووەتەوە:

لەبەر نازی چاوبازان
خواردن و خەوم خوێناوە
بەتیری تیر ئەندازان
چی بکەم جەرگم بڕاوە
ئەی یاری میهرەبانم
ئارامم هەڵگیراوە
بیمار و هەراسانم
دوور بای دڵت گۆڕاوە!

***

سۆزی دەروونم گەرمە
چون سەرم لێ شێواوە
چ بکەم مەڵێن بێ حاڵە
هۆشم لەلا نەماوە

***

غەرقی لافاوی ئەسرین
سەر هەتا پام خوێناوە
خۆکانیاو نەجۆشاوە
پەردەی دڵم دڕاوە

***

ئەی یاری سەر بەنازم
نازانی چی قەوماوە؟
ڕەقیب وا لە کەمینا
چمان مەیلت نەماوە؟

***

ڕیسوای عەشقی ئازیزم
نامەوێ لەو بەولاوە
لە خومخانەی وەفادا
خۆم لە خومی ئەو داوە

***

سووسەی ئومێد و هەستیم
دە لاکەرۆ بەم لاوە
لە خۆم شەیداتر کوانێ
بەسەر عەرزی خوداوە

***

وەفا ئایین و پاکم
قەت لە ڕێ لام نەداوە
با صەفا و سینە چاکم
بەم سەری پڕ سەوداوە

***

عیشقی خاوێن «هێژا»یە
وانە بێ چاووڕاوە
پێویستە لێت ڕەزا بێ
ئەوەی دڵت پێ داوە



## دەواری یار

هەستام و چوومە سەیری
خێڵوەز و جێی هەواری
سەر هەرد و لای ڕەشماڵی
دڵنشین و دەواری

***

سەرخێڵی دیدەمەستان
ئێسک سووکی میهرەبان
دلبەری خێڵ خاڵ خاسان
سەرکردەی عێل و دیاری

***

دیمەنی کێو و شێوی
سەر یاڵ ئەمدیوە و دیوی
خێڵ و هۆزی بەزیوی
بێ وێنە و کەس نەداری

***

گوڵزاری ڕەنگاوڕەنگی
کانیی ڕوون و قەشەنگی
زەنبەقی شۆخ و شەنگی
مەس، نەرگسی خوماری

***

ئاوی ڕوون و زەلاڵی
بەفراوی سەر نەهاڵی
قەڵوەز و ناڵەناڵی
سامفۆنیی «مۆتزار»ی

***

نەسیمی نەرمی فێنک
جیکەی شەوە و مەلیچک
لەسەر بتە و بن بنچک
ورتەی چینەی گوواری

***

دەستە دەستە کوڕوکاڵ
گەورە کچی ناو ڕەشماڵ
بەنەوای «هەی بێ»ی شمشاڵ
دوو دوو بەرەو دیداری

***

دوو دەسماڵە و ڕەشبەڵەک
گەورە کچی چاو بەڵەک
دەنگی دەڕوا تا فەڵەک
نەوای «ئای ئای» قەتاری

***

هەڵپەڕکێیە گەنم و جۆ
بەیانی تا نیوەڕۆ
گشت دێنە ناوی کۆڕۆ
یاری، گەرم ئەکا، یاری

***

دۆس و دڵ و دەسگیران
دانامە و گەنج و جەوان
تیر ئەنێنە ناو کەوان
هەر کە بەرەو شکاری

***



خوایە چ دڵنشینە
سینەی صاف و بێ کینە
ئەو بازاڕی ئەوینە
پاک و بێ دڵ ئازاری

***

خوایە خۆشم لێ ڕابوورد
سەیرانێکی سەیرم کرد
غەمی لە دڵما لابرد
دیمەنی گوڵغوزاری

***

ئەهات بە لارە و لەنجە
نەونەمام بە سەرپەنجە
دەرمانی ئەوی ڕەنجە
دیدەی مەست و خوماری

***

زەردەخەنەی پەی دەرپەی
خرمەی لوولە و هەیاسەی
عەطری کیسڵە و هەناسەی
پەزێرایی شاکاری

***

ئەی گەنج و لاوی سەرمەس
ئەی دڵدۆڕاوی دەربەس
ئەی دا نامە، ئەی نەوڕەس
ئەی کیژی کوردەواری

***

ئەم وەڵاتەت بەهەشتە
دەشت و دەری گوڵگەشتە
ئێوەن پەری و فریشتەی
دێ و هەوار و ناو شاری

***

قەدری نیعمەت بزانە
هەر کەیفی تیا بڕانە
نیعمەتی کوردستانە
وتم یەک لە هەزاری

***

هەر گۆشەیێ لەم خاکە
ئەسیر و جوان و پاکە
پێت ئەڵێ دەی ئازا کە
(هێژا) بەرەو ڕزگاری



## تیری ناز

پێکراوی تیری نازی، گیرۆدەی چاوی بازی
چاوەڕێم لام لێوە کا، بە ئاییینی، دڵخوازی
گەردەنکەش و مەغرووره، دڵڕوبایێ مەشهووره
نازدارێ، بێ قصووره، سەر دەرناکەم لە ڕازی
خوێن گەرم و نازەنینە، خۆش ئەخلاق و شیرینە
غونچە گوڵی ئەوینە، چەن ئاورینە نازی
لەنجە و ئەدا و ئەتواری، سەرمەس دەکا دڵداری
زەردەخەنە و ڕەفتاری، شادکامی هەمرازی
شۆخی و مەزاحی خۆشی، مەجلیسی عەیش و نۆشی
تیمارە بۆ نەخۆشی، زاری نوکتە پەردازی
قامەت و باڵای بەرزی، شیرین سیمای خۆشتەرزی
جوانی بێ ڕادە و مەرزی، بەسە بۆ سەر فەرازی
ئارامی ڕۆح و گیانە، سالار و دڵستانە
فەرمانڕەوای دڵانە، ئیشارەی دڵنەوازی
دڵم زوو نایە سەر دەس، بۆ کیژە کوردی چاومەس
فەرمووی دێوانەی سەربەس، ئەزانم، پاکبازی
ئەوی مەرد و (هێژا)یە، بەڕاست شێتە و شەیدایە
مەتڵەبێکی گۆیایە، دڵداری و عەشقبازی

## ئافەرین ئەی وێنەگر

نیشتمان کوێستانەکانت کێوی تووری ڕۆڵەتە
خاکەکەت کابەی مورادە، باغەکانت جەننەتە
کانیاوت ئاوی حەیوانە
صافە و گەوارایە، جوانە
تابلۆیە، نەخشی یەزدانە
ئاوا بێ ئەم نیشتمانە
دڵ بە قوربانی شنەی کوێستانەکانت بەربەیان
گیان بە سەرگەردت، غوڵامت عاشق و دێوانەتە
شنەی بات قووتی ڕەوانە
سروەکەت ئارامی گیانە
دەشت و دەر باغی جینانە
ئاوا بێ ئەم نیشتمانە
ڕێنمای مەعشووقە خاکم دیمەنی بۆ دڵبەری
ئافەرین ئەی وێنەگر، وا وێنەکەت پڕ زینەتە
باغاتت باغی ڕیضوانە
ڕەنگینە کوێستانت، جوانە
ڕەبی چەن لە بەر دڵانە
ئاوا بێ ئەم نیشتمانە
نیشتمان کوێستانەکانت کێوی تووری ڕۆڵەتە
خاکەکەت کابەی مورادە، باغەکانت جەننەتە



## کیژی کرچ و کاڵ

بولبولی گوڵزاری کوردستان مەزهەری خالقی خوێندی

کشەی بای شەماڵ، بڕوا یاڵە و یاڵ
لوول دا، ئەگریجەی کیژی کرچ و کاڵ
ئەی با! بە ئارام بشنێ مەوەستە
سروەت بێ وەزگەت ئێستا بەهەشتە
کۆسالان وێنەی سالان گوڵگەشتە
مەئوای سەروەران، گوڵ پێیدا وەشتە
ئەی مەئوای مەردان چەن دڵنشینی!
لانەی سەرکەشان موڵکی شیرینی
ئەو خاکە مەکۆی شێری ژیانە
جێگای شانازیی کورد و گۆرانە
ئەی نیشتمانم، ئەی دڵ و گیانم
ئاوا بێ! یاخوا زێدی کوردانم
هەوات قووتی ڕۆح، سروەت حەیاتم
خاکت پۆشاکم، ئاوت بەراتم
ئەی نیشتمانم ئەی زادگاهم
عیشقت ژیانم، یادت پەناهم

## تیشکی ئاسۆ

بەبێ نەسیمت، ئەگەر بسرەوم
لێم حەرام نەبێ خواردنم، خەوم
نەمێنم، نەمێنم
بەر لووتی تیژی سەر خەنجەر کەوم
بەر مەودای بوڕڕای دەم نەشتەر کەوم
تیشکی سەر ئاسۆت مایەی ژیانم
نەسیمی سوبحت ئارامی گیانم
چەن جوانە، زۆر جوانە
سەر بە سەرگەردی شنۆی دەشتت کەم
دڵ بە قوربانی نەشەی گەشتت کەم
باغت صەفابەخش کورکەی دڵانە
کوێستانت ڕاوگەی کورد و گۆرانە
ئاوا بێ، ئاوا بێ
من سەوداسەری ئەم نیشتمانەم
بولبولی غونچەی ئەم باغە جوانەم



## ئاواز

تافی ئاوی صافی کوێستانت، وەطەن، چەن دڵبەرە
سووسەیی شەوبا و نەسیمت عەطری میسک و عەنبەرە
نامەوێ موڵکی جیهان و ژینی دایم طوولی عومر
تاکە ئاواتم سەر ئەفرازیتە بەو خوای بان سەرە

## کیژۆڵەی کوێستان

«۱۳٤۰/۱۲/۲۲ هـ. ش تاران»

هەی فەریاد لە دەس دەروونی کەیلم
سەراسیمەی سام پڕ جەفای لەیلم
لەیلی نازەنین، کیژۆڵەی شەرمین، دۆسی خوێن شیرین
پێکراوی تیری نازی بێ مەیلم
گیرۆدەی دەرد و شکەنجەی وەیلم
لەیلی بێ مەیلم، دەسخەڕەی مەیلم، داماوم، کەیلم
ویردی زمانم واوەیلای دووری
شکا بە هیجران شیشەی سەبووری
یەکجار دڵتەنگم، گۆڕاوە ڕەنگم، ناتگاتێ دەنگم
سوراحیی سەبرم دائەڕێژێ مەی
پەیمانەی پیاڵەی دیدەم پەیاپەی
زەدەی هیجرانم، بۆیە ناڵانم، چاو بە گریانم
نەوام ئاخ و داخ، حەسرەتم هاودەم
شادیم شین، موطریب سۆزی هەناسەم
هاودەمی ڕازم، یاری پڕ نازم، دۆستی دڵخوازم
مەزەم کەبابی جەرگی بوریانە
ساز و ئاوازم نەوای گریانە
جەرگی سووتاوم، دڵ پڕووزاوم، تەواو فەوتاوم
بێ گەرد، نازەنین، سەروی پای سەهەن
بێ مەیلی بۆچی، دووری هەتا چەن
سەروی ئیلاخان، ناسکۆڵەی چاو جوان، کیژۆڵەی کوێستان
سوراحی و مەی و موطریب و گوڵزار
حەیفە بێ ئاڵای باڵای بەرزی یار



گوڵی گوڵزارم، بە لەنجەولارم، تووتی گوفتارم
ئەساسەی شادی لە گوڵزار جەمە
شادی من هەر تۆی حەیفە تۆم کەمە
عەینی شەمشادیی، سەروی ئازادی، فەرموو بۆ شادی

ئەم بەستەیەم لەسەر داواکردنی گرووپی مۆسیقای کوردی ڕێکخست، ئیتر نازانم خوێنرا یا نا، ئەڵبەت ئەوە بۆ بەستەیێ زۆر بوو، جا چونکە خوانندەکە لەوێ نەبوو، پێم وتن هەر بەندێکتان پێ خۆش بوو بیلێین.

## عیشقی خاوێن

مەزهەری خالەقی خوێندی

به هەوای عیشقی دڵ پڕ خرۆشه
وێنەی پەروانەش بپڕووزێ خۆشه
عیشقم خاوێنه، دڵ بەپەرۆشه
ئەو عیشقه، عیشقی وەڵاته، وەڵاته، وەڵاته
ئەی وەطەن گیانم فیداته، فیداته، فیداته
نەسیمت عەطر و میسک و عەبیره
دیمەنت جوان و خۆش و دڵگیره
زیخت دانه و دوڕ خاکت ئەکسیره
خوایه ئەو خاکه چەن جوانه
چەن جوانه، چەن جوانه
بەهەشتی بەرین باغی ڕیضوانه
ڕیضوانه، ڕیضوانه، ڕیضوانه

***



بولبولی باغی موڵکی کوردانم
کاوه نەژادم، خەڵکی ئێرانم
بەسته ئەخوێنم بۆ نیشتمانم
ئەی خوایه، ئەم باغه چەن خۆشه، چەن خۆشه، چەن خۆشه
ئەو دەنگه بانگی سرووشه، سرووشه، سرووشه، سرووشه
شەرته تا ماوم تۆم لە توێ دڵ بێ
تۆیی ئە بێ تۆس، ئاوێتەی گڵ بێ
گیان فیدات نەبێ گیرۆدەی چڵ بێ
ئارياییم، خەڵکی ئێرانم، ئێرانم، ئێرانم
بولبولی خاکی کوردانم، کوردانم، کوردانم

## ئامینێی تاقانەی دایێ

خالەقی خوێندوویەتی

شیعری بەستەکە فۆلکلۆرە، بەڵام برێ دەسکاریم کردووە

چاوت ڕەشـــە، بە خــومـــارەوە
مـــەمکت ســـێـــوە بە دارەوە
خـــودا داویە، مـــەیشـــارەوە
ئامینێی تاقانەی دایێ، (ئامینێم، ئامینێم، ئامینێم)، بریا یاری من بایێ

***

ئامـــــینێی تاقـــانەی دایێ
ئەپارێمـــــــەوە لە خـــــودایێ
ســـــەد بریا یـار لای من بایێ
تا گـــــیــــــان و دڵم پێ دایێ

***

چاوت مەستن، پەیوەس ئەبرۆت
بەو خـاڵانەی دەوری لیـمـۆت
یار وەختـە گیـانم دەرچێ بۆت
ئامینێی تاقانەیدایێ، (ئامینێم، ئامینێم، ئامینێم)، دەکبریا یاریخۆم بایێ
صـــەد بریا، یاری خـــۆم بایێ
خـۆزگـە ئەو (هەر) لێـرە بایێ
نەمـــــدەدا بە دوو دونیـــــایێ
ئامـــــینێی تاقـــانەی دایێ

***

چاوت ئەڵێی «دو» دیدەی بازن
مـەست و بوخـــمـــار و پڕ نازن
بۆ من کـــوشتن چە داوخـــوازن
ئامینێی تاقانەی دایێ، (ئامینێم، ئامینێم، ئامینێم)، بریا یاری خۆم ببوایێ

***



صـــەد بریا یار لێـــرە بایێ
ئەپاڕامـــــەوە لە خـــــودایێ
شـــەو بە مـــیـــوانی من بایێ
ئامـــــینێی تاقـــانەی دایێ

## ئای شل

«کاک مەزهەری خالقی خوێندوویەتی»
«بەیتی سەرەتای بەستەکە فۆلکلۆرە»

ئای شل وەی شل، شل و شێواوی
ئەڵێی وەنەوشەی شەونم لێی داوی
لە چی زویری، بۆچی تۆراوی؟
بە سەر گەردت بم، لە کێ ڕەنجاوی

***

ئەمشەو، ئازیزم، بانگم بێ شەرمە
زایلەی سۆزی سەمتوورم گەرمە
بۆی وەصڵی ئازیز دێتە دەماخم
بۆیە لەم بەزما ئەمشەو گوستاخم
ئەرێ شل، هەی شل شل و شێواوی
ئەڵێی نەوبووکی زاوا لێی داوی

***

نەی چی فووی پیاکە سادەی بێ درەنگ
پەنجە لەسەر نەی شل کە، بیربە درەنگ
هەر تەرزێ بۆ خۆی لێ بدا ڕازێ
لە دەروون بگرێ هەر نەوا گازێ
مەدهۆش بێ هەر کەس بەپێی سەودای خۆی
سەر خۆش کە هەرکەس بەپێی غەوغای خۆی
ئامان شل ئای شل، ئەڵێن تۆراوی
بۆچی لەسەرچی لە من ڕەنجاوی

***



هەر کەسێ حەزی لە نەوایێکە
چارەی هەر دەردێ بە دەوایێکە
نەی چی! کام مەقام جێگەر تاوێنە
تڵفی بێ چارەی دڵە و لاوێنە
ئەو نەوا لێدە نەرم و دڵگەش بێ
ئەو سۆزە لێدە قیبلەم پێی خۆش بێ
ئەرێ شل، ئای شل، شل و شێواوی
بۆچی لەسەر چی! لە من تۆراوی

## سەحەر

١٣٤١/٣/١٧ی هـ.ش

سەحەر کاتێ دەمی کردۆ وەکو غونچە گوڵی زارت
لە هەرلا ناڵە بەرزۆ بوو لە خێڵی عاشقی زارت
خوداوەندا! چ گیانبەخشن، دو گوڵبەرگی تەڕ و تازە
(تعالی الله) چ خۆشڕەنگن، دو نەوڕەس گوڵبەدەم نارت
بە یەک غەمزە بە سەر کوڵمانۆ لاچوو زوڵمەتی گیسوو
هەزار ئەفسوونی تێدابوو، بە بێ شک چاوی سەحەحارت
خەدەنگی غەمزەکەت ئەڵماس و، دڵ وەک شیشەیی نازک
کەسێ دێوانەیە وەک من، ئەگەر چووبێتە پەیکارت
ئەگەر باری غەمی تۆیە، ئەگەر جەوری ڕەقیبانە
بە شەرتێ مەیلی تۆی لێ بێ ئەمن ڕازیم بە هەر بارت
مەکە باوەڕ بە دیدارێ لە تۆ تێر بێ دڵ و دیدە
بە دیدارت هەتا مردن، ئەگەر تێر بم لە دیدارت
بەخوا بەو غایەتەش یارت، نەبوونا میهرەبان ئامان
لە ئاهی ئاوڕینی من خودا گیر بێ سەبەبکارت

پێشنووسی ئەم پارچە شیعرە لەناو جەنجاڵی پێشنووسەکانما بوو، ئەڵبەت غەڵەت و پەڵەتی زۆری تیا بوو کە ئیسلاحم کردبوو، بەڵام نازانم لە ئەسلا هێ کێیە ئایا هەر هیی خۆمە یا هیی شاعیرێکی ترە و من ڕێکوپێکم کردووە.



## ڕانە بێرە

مەزهەری خالقی خوێندی

بۆ بێرە ئەچی، لەنجەولار مەکە
جەهێڵ بە گۆشەی چاو زامار مەکە
وای گەرد و، گەرد و گەردانە، کوشتمی ئەو جووتە چاوانە
یارم شەمعە، خۆم پەروانە، کوشتمی ئەو جووتە چاوانە

***

مەشکۆڵەی شیرت مەخە لای شانت
نەکو ماندووبی دوور بێ لە گیانت
ئای شۆخی ڕانەبێرگەکەم
گوراڵەی ناوی مێرگەکەم
هەناو و ڕۆح و جیگەرکەم

***

لەناو ڕانەدا کەم شانە و شان کە
کەم شێت و شەیدای باڵات هەرزان کە
ئارامی ڕۆح و گیانەکەم
هیوای دڵ و ڕەوانەکەم
بە فدات بێ سەرجەم ڕانەکەم

***

خاوەن ڕان سەرگەرد ڕێگای ڕانەکەت
چۆپان بەقوربان بانگ کێشانەکەت
ڕاندۆش پێشکەش بێ ڕانەکەم
تۆ بانگ مەکە، من بانگ ئەکەم
گشت ڕانەکەت قوربان ئەکەم

***

مەڕێ بانگ ئەکەی گشتی تێتە سەر
خاوەن ڕان و ڕان سەراسیمە سەر
ئەی ڕاندۆش سەرپۆشت لادە
دەس بگرە و چۆپیی بۆ بادە
بانگمان کە شۆخی خانزادە

ئەم گۆرانییە (بەگەرد و گەرد) بەناوبانگە منیش بۆ ئەوەی ناوە فۆلکلۆرییەکەی ون نەبێ. لە بەیتی یەکەما ناوە کۆنەکەیم هێناوە.



## گیانەکەم نەرگس

«فۆلکلۆرە بەڵام شیعرەکانی دەسکاری کران»
١٣٤١/٣/٢٨هـ.ش

خانم قەمەری بنەی ئاردەڵان خوێندی نەوای کرماشانییە و بەو زاراوەیەش سازکراوە

دی شەو دیم جە خەو دوو کووک مەکوکان
تومەس یە لەیلێش مەجنوون مەلاوان
عەمرەکەم، ڕووحەکەم، گیانەکەم نەرگس
هەر تۆ یارمی «خاڵ حاسم» ، دووسەکەم نەرگس

***

دی شەو تا سەحەر شەم سووزانم بی
دڵخوەشیم یەبوی دووس میمانم بی
عەمرەکەم، ڕووحەکەم گیانەکەم نەرگس
هەر تۆ یارمی «خاڵخاسم» ، ڕووحەکەم نەرگس

***

فیدای ماڵەکەی پای پەڕاوت بام
فیدای دوو دیدەی شەو بی خاوت بام
عەمرەکەم، ڕووحەکەم، گیانەکەم نەرگس
هەر تۆ یارمی، «عەزیزەکەم» ، عەمرەکەم نەرگس

***

من، چەوتیمە دووس بیسە دڵگیر
وە زلفت سەوگەن من نەیرم تەقصیر
عەمرەکەم، ڕووحەکەم، گیانەکەم نەرگس
هەر خوەت یارمی، «عەزیزەکەم» ، ژینەکەم نەرگس

## یانە

ئەم بەستەیەم بۆ مەزهەری خالقی وت

نازداری، نازەنینی، چەندە لە بەر دڵانی
کاتێ چاوت هەڵدێنی، ئەڵێی بازی تەڕلانی
خۆشمەویێی، ئەتلاوێنم
وەک کەوێ بۆت ئەخوێنم
ڕەم مەکە نازدارەکەم
بمکوژی ناترەنجێنم

***

لە مولڵکی عیشقۆ هاتم ڕێم کەوتە ئەم وەڵاتە
ڕێبواری ئەو ڕێگامە چیبکەم لانەی سەوداتم
شەشدەرم لێ بەسراوە، تەنیا چارەم پەناتە
تۆی تەنیا ئاواتەکەم
ئارەزووی بیساتەکەم!
تۆی شادیی شەو و ڕۆژم
یادی کات و ساتەکەم

***

مەزلووم و بێ تاوانم، گوناهی خۆم نازانم
لەسەرچی لێم ناپرسی، سەد جار دەردت لە گیانم
ئەر تاوان بار کراوم، ببەخشە چون میوانم
لێم گەڕێ تەنگە تاوم
لێم مەگرە، دڵبڕاوم
بێ چارەم کە فەوتاوم
هەردەم و لێقەوماوم

***



ئەو ڕێگە زۆر هەورازە
هۆشیار بە، دڵ مەبازە
دەستەڵاتی کەس نییە
ئەو کە هەر تۆی نیازە
بۆیە گوێ بە کەس نادەم
یارم عاشق نەوازە
غەریب و دڵ پەشێوم
سەیری کە باری لێوم
دەی ڕەحمێ بە حاڵم کەن
مەجنوونی دەشت و کێوم

## وەرگەڕێ

مەزهەری خالقی خوێندوویە بەسەر شریتی ژمارە (KL/٤٢٨٤)ی ڕادیو ئێرانەوە تۆمار کراوە.

«قاز» و «سۆمە» و «بەت» لە ئاوا
بە پۆل بەستوون، لە سەراوا
ئاو ئەیانبا، بە بێ پەروا
چەندە جوانن، لە گۆلاوا
وەرگەڕێ، ئاوێزانت بم
وەرگەڕێ، شەو میوانت بم

***

هەوران پەلیان داکێشاوە
تەمە و هەواکەش شێواوە
مەلانیش پەڕیان ژاکاوە
چەن قەشەنگن لەو گوێ ئاوە
وا وەرە، ڕێگاکەت دوورە
بۆ دەڕۆی، چوونت زەروورە؟

***

تاوی تەرزە و هەور و باران
کزەی شەو با و زوقم و بۆران
مەڕۆ، ساردە ڕێگای کوێستان
گوێ لە من کە، دۆستی جاران
پێم خۆشە خۆم خانە خوێت بم
مەڕۆ تا خاکی بەرپێت بم
مەڕۆ، گیانە، ڕێ گیراوە
ئاوی ڕۆخانان هەستاوە
بۆ کوێ ئەچی بەم لافاوە



بۆچی بڕوات پێم نەماوە؟
وەرگەڕێ، ئاوێزانت بم
وا وەرە، با حەیرانت بم
سا وەرە، شەو میوانت بم
شەرتەکەم ڕۆژ قوربانت بم

ئەلبەت سەردێری فولکلۆرەکەیم (وەرگەڕێ ئاویزانت بم) لەناو بەستەکەدا هێناوە تا ون نەبێت.

# هەی خاڵ

گۆرانیی «هەی خاڵ» گۆرانییەکی فۆلکلۆریی زاراوەی هەورامییە، چونکە هۆنراوەکاینم بە دڵ نەبوو خۆم هۆنراوەم بۆ دانا. پێویستە ئەوەش بڵێم کە کاک یوسف زەمانی، کەمێ ئاهەنگەکەی گۆڕیوە، کاک مەزهەری خالقی بەنەوای لەتیفتر لە حەریری خۆی خوێندی و بەسەر شریتی KL ی ژمارە ٧-٩-١٣٤٢/٤٢٦٤ی ڕادیو ئێرانەوە تۆمارکراوە.

کوێستانان ئارام، هەوارگە ماتەم
لانزار بێدەنگ چون خێڵخانەی خەم
هەی یار، هەی غەمخوار
یار شادیی گیانم
بێرۆ بۆ کوێستان
زۆر چاوەڕوانم

***

«سوورە هەراڵە» و «چنوور» و «شەوبۆ»
«گۆڕاڵە» و «مەرزە» و «وەرکەمەر» و «لۆ»
بەفراوانی ساف
بەر قەڵوەز و تاف
خۆش نییە بێ تۆ
کۆچ کە خۆش ئینساف

***

سەر دەلیلەی کەڵ، کێشکچیی ڕێگات
کەوی دەنووک سوور تیپی مۆسیقات
هەی بێرۆ سا بێ
بەو جۆرە نابێ
قشلاخ ناگەوار
دەی بۆ ئێلاخ بێ

***



پایە نازت کەم «سیسەن» و «سۆسەن»
چەبکەی «گا و گۆڕاڵ» دەستەی «یاسەمەن»
ئامانە ئەی دۆس
دڵ و گیانم دۆس
بێرۆ وارگەی خۆت
دڵی دۆس جێی تۆس

***

زایڵەی زەنگی کاروانێ وە مەیل
ئەدا مزگانی وادەی کۆچی لەیل
نە جای مزگانیی، دڵ پێش سپەردم
دڵ کام دڵ؟ دڵەی بە مەیل لەیل کەیل
شەماڵ جاڕ کێشۆ وە کوێساناندا
ها دیسان وەختەن شاد بیدێ وە لەیل

بۆ گۆرانیی (سەوزە هەی سەوزە) هۆندمەوە و سوژەکەی (مازوچنین)ە، ناومان نا (بووکی ناو جەنگەڵ). مەزهەری خالقی خوێندی

## بووکی ناو جەنگەڵ

ئەی مینای بێ گەرد! لیمۆ لە باخەڵ
سەروی باڵا بەرز، بووکی ناو جەنگەڵ
تەقەی مازووچن لە لادۆڵ و شیو
«میراجی» و «گارِان»، «باخان» و «سەرشیو»
ئاوازی «غەریب»، «رِێبوار» و «هەی خاڵ»
«تەنکە» و «چاورِەشێ» بە سۆزی شمشاڵ
کورِ بە ناڵەی دڵ، کچ بە چریکەی ناز
هەردوو، دەرئەبرِن بۆ یەکتری رِاز
نیوەرِۆ مەنزڵ کانی «ژەرەژان»
«رِەشبەڵەک» گەرمە «گەرِیان» شانە و شان
من کز و تەنیا گۆشەنشینم
کەس دەسم ناگرێ، ماتم خەمینم
تۆ بۆ نەهاتی بۆ مازو چنین!
نەختێ دەس بگرین، کەمێ هەڵپەرِین
ئەر نەتزانیوە هەستە، بێ، دێرە!
تۆ «هۆمەرمەنان» زوو بێ بێ بۆ ئێرە
ئەگەر لێم زیزی ئارامی گیانم
دەی لێم ببوورە رِۆحی رِەوانم

مازوو چنین: لە دێهاتە جەنگەڵەکانا رِەسمی کورِ و کچی دێ لە سەرەتای مانگی سێهەمی پایزا بە جەم ئەچنە ناو جەنگەڵ بۆ چنینی «مازو». کاتی نیوەرِۆ هەموو لە جێ ژوانێکا (سەر کانی وئاوی مێرگولانێ) شوێنی خۆش کۆ ئەبنەوە و قاوە تێ ئەکەن و (جا دەس ئەکەن بە هەڵپەرِین).



## لەیلا

(لەیلا) پێم وایە کاک مەزهەری خالقی خوێندوویە بەڵام، بەتەواوی دڵنیا نیم و، حەسەن زیرەکیش خوێندوویەتی.

لەیلا لەیلا، لەیلایە، لێم ببرِێ، لەیلا شۆڵەی چرایە
خۆشمدەوێ بۆ بتۆرِێ، لێم ببرِبی، لێم ببوورێ، دڵ بگۆرِێ
چۆن رِەوایە؟ کەی وەهایە؟ دڵ و گیانم لەرِێیایە سەرم لە بەر پێیایە

***

لەیلا تۆ خۆت ئەزانی چەندە لە بەردڵانی
ئەگەر بێت و بمدوێنی، نەمشەمزێنی، بملاوێنی، بمخاوێنی
شادم کەی، نەمرِەنجێنی، سەرم ئەدەم لە مزگێنی، دڵ ئەدەم لە مزگێنی

***

لەیلا باغات پشکو پرِە کەسکە و سەوزە، رِویوە، ئاوی چاوەکەش تەقیوە
چەشنی زیوە، گوڵ خەملیوە، جوان خەملیوە، نەرگس بە تیپ لەو شیوە
پێی لە ئاوا تەزیوە، چەن دڵگیرە ئەوشیوە

***

لەنجەی گولان هەرزانە شەماڵە و شانە و شانە، سەیری کە ئەو سەیوانە
چەن جوانە و خنجیلانە ئەو گولانە، ئەو گولانە
وەرە دڵ چاوەرِوانە ماتە، بۆت پەرێشانە
بێ تۆماڵی وێرانە
ماڵ وێرانە

***

عاشق پیشە و هەژارم، بۆیە پێ لە گوڵزارم، هاونشینی هەزارم
نزارم و لێو بەبارم، بێرۆ یاری نازدارم، چارەی دڵی بیمارم
بێرۆ یاری نازدار، زۆر خومارم، زۆر هەژارم
بێرۆ گوڵی گوڵزارم، بێرۆ دۆسی غەمخوارم
بێرۆ یاری نازدارم

مەزهەری خالقی خوێندوویەتی، وە لەسەر شریتی kl ی٤٣٩٠، ١٢/ ١٠/١٩٤٢ شمی تۆمارکراوە

## کیژۆڵەی کوردستانی

کیژۆڵەی کوردستانی
لاوی جوانی سۆرانی!
سوورە گوڵی کوێستانی
نەوباوەی ناو شاخانی
نەرمۆڵە و ناسک و جوانی!
تەنکەڵەی هەورامانی

***

ئێستە بەهار ڕەنگینە
ناو چیا کەسک و شینە
ئاڵ و واڵ و شیرینە
تیپی گوڵ نازەنینە
وەک بەهەشتی بەرینە
ناز مەکە، بێ و بیبینە

***

نە تەنیا بەهار جوانە
خەملیوە ئەو کوێستانە
هەمیشە ئەو، شاخانە
پڕ شکۆ و بە عینوانە
دڵ لە لات چاوەڕوانە
لەنجە خۆش سا بێ بزانە

***



لە دڵدایە ئاواتێ
چی بکەم یار گوێم ناداتێ
ئاخ بۆ تەوان و زاتێ
ئەو پەیامەی بداتێ
بێتە جێ ژوانم ساتێ
موژدەی ژینم بداتێ

***

بێ ئەو ژینم حەرامە
هەناوم زووخ و زامە
دەروونم بێ ئارامە
هەر عیشقی ئەو سەودامە
یارم بالاّ نەمامە
بێ ئەو ژینم بێ تامە

## سروودی نیشتمانی

سەربەندەکەی تەکرارییە لە تەصنیفی تریشا وێژراوە، بەڵام بەیتەکانی تری جوێن، وە ناشزانم بەم شکڵە خوێنراوە یا نا (پێنج خشتەکی).

نیشتمان! کوێستانەکانت کێوی تووری ڕۆڵەتە
خاکەکەت کابەی مورادە، باغەکانت جەننەتە
گەنج و لاوت چستوچالاکە، هەڵۆی پڕ هەڵمەتە
کاتی ڕاوی دوژمنانت، پڕ تەوان و قودرەتە
مایەیی شانازیی هۆز و ئیفتیخاری میللەتە

***

ڕوونە سەر ئاسۆت وەکو ڕووناکیی قەلبی عاریفان
سووسە بات عیسا دەمە، چارە و عیلاجی ئافەتە
دڵ ئەکا حەیران شنەی کوێستانەکانت بەربەیان
دەک بە سەر گەردی سەرت، دڵ عاشیق و دێوانەتە
ڕەشدەواری سەرهەوار دانیش سەرای فەرزانەتە

***

زەردەیی ئێوارەکەت لەنجەندی نازی دلبەران
یاری نازکێشت فیدایی نازی زەردە و خەندەتە
ڕێنمای مەعشووقە گوڵگەشتت وەتەن! بۆ دلبەران
ئافەرین ئەی وێنەگر! بێ وێنەیە ئەو پەردەتە
تابلۆی ڕەنگین و نەخشینت، نموونەی زینەتە



## گۆرانی

بۆ گۆرانیی (زەماوەند)م هۆندەوە و مەزهەری خالقی لە ١٣٤٢/٥/١٠ی ھ.ش. لە تاران خوێندی.

ماین بە ڕەختۆ بێ، «کچ» بە لەرزانە
«ژن» سەروێن لەسەر بێ «کوڕ» بە جامانە
جوانە تێک ئالێین (لەرزانە) لەچک و فەقیانە
شادییە زەماوەندە، خەنەبەندانە
ڕەشبەڵەک گێراوە، سێ چین لەو بانە
***
کوردە ژن بە لەنجە، کوڕ بێ سەر پەنجە!
چۆپی کێش بەلەنگەر، کیژ چاوەڕێی گەنجە
جوانە، زۆر جوانە (لەرزانە) بەزمی کوردانە
شادییە زەماوەندە، خەنەبەندانە
ڕەشبەڵەک گێراوە سێ چین لەو بانە
***
نەیچی! پەنجە شل کە، جا سوڕناژەن لێ دە!
دەهۆڵکوت، زرمەت بێ، چاک دەنگی پێ دە!
جوانە، زۆر جوانە، (لەرزانە) ڕەسمی کوردانە
شادییە، زەماوەندە، خەنەبەندانە
ڕەشبەڵەک گێراوە سێ چین لەو بانە
***
گەنم و جۆ تێکالێین، کوڕ و کاڵ! ئا دەی!
گەورە کچ! سا زوو کە جوان چۆپی بۆ بادەی
سڕناژەن پیقەت بێ، دەهۆڵکوت بای دە
شادیە زەماوەندە، گەنم و جۆیە، جوانە
سۆرانی کەن تێکەڵ، سەر پەلکە و جامانە

***

لەرزانە، لەرزانە، بەزمی کوردانە
ڕەشبەڵەک گێراوە سێ چین لەو بانە

## کاشکی

لەسەر داواکردنی هونەرمەند و مۆسیقیزانی کورد ئاغا حەسەنی یوسفزەمانی ئەم بەستە فارسییەم هۆندەوە، وە قەرار وابوو خانمی (مەهەستی) گۆرانی ویژی بەناوبانگی فارسی لەگەڵ دەستەی مۆسیقیی کوردی بە سەرپەرشتی حەسەن یوسفزەمانی تۆماری کەن، پاشان تۆمارکردنەکەی دواکەوت و نەخوێنرا.

کاشکی این دام ها ازهم گسستی، کاشکی
کاشکی این قید هم، درهم شکستی کاشکی
از قفس پر میزدم تا کهکشان
از فسون ازاده گشتم در جهان
دام و مکر زندگی را، این فسون بندگی را، پاره کردم کاشکی، پاره کردم کاشکی
این گل پژمرده ء خود، این دل افسرده ء خود، چارەکردم، کاشکی، چارەکردم، کاشکی

***

زندگی با زرق و برق آیا رواست خیر، خیر
زندگی با مکر و دلق ئایا سزاست: خیر، خیر
آدمی را زندگی، از عشق بود
وز سروش غیب این آوا شنود
نوشدار و عشق و ئایین عشق و راز زندگی
عشق را تنها سزد تعظیم و طوق بندگی
زاده ء عشقیم گویا در ازل
زندگی بی عشق گرداب دغل
زندگی با عشق سازد، بندگی با عشق و بس
عشق شادی آفرین و آفرین بر عشق بس
لب بخندد، دم بگوید، دل کند گفت و شنود
دیده گرید، غم بسوزد، به ازین بود و بنود

***



دانەی گوهر مپاش و دام برمردم منه
ساز دل با خلق دار و دانه، گوهر مده
حرف شیرین برمفشان، دانه ء اسرین مریز
گرم و چربی کم کن و با جمع مظلومان ستیز
کاشکی این دام هم از هم گسستی، کاشکی
کاشکی این قید هم درهم شکستی، کاشکی
از قفس پر میزدم تا کهکشان
از فسون ئازاد گشتم در جهان

## ئامان سەد ئامان

بولبولی خۆش ئاواز مەزهەر خوێندی

ها فەسڵی پایز تازەی کردۆ مەیل
لانزار ڕەنگین، لە ڕەشتەی سووەیل
خێڵ ئەو خوار هاتۆ کەژاوەکەی لەیل
ئامان سەد ئامان، حاڵی پەرێشان، مەپرسن ئامان
چەرخی چاوانی سەریان لێم شێوان

***

مەپرسن بۆچی مەست و سەرخۆشم
بێ بادە، بادەی مەستی ئەنۆشم
خوماری شەراب کام مەیفرۆشم
ئامان سەد ئامان، حاڵی پەرێشان، مەپرسن ئامان
چەرخی چاوانی سەریان لێم شێوان

***

مەستی، بێ بادەی ئەوین مەحاڵە
بێ غەمزەی دلبەر بە جام و پیاڵە
شۆری مەستی مەی بێ ئەو بەتاڵە
ئامان سەد ئامان، حاڵی پەرێشان، مەپرسن ئامان
چەرخی چاوانی سەریان لێم شێوان

***

گیانە! بەسیەتی گەشتی ئێلاخان
بێرەوە قشلاخ بەرزە دەماخان
سەر بدەن لە شوێن کۆنە ئوجاخان
ئامان سەد ئامان، حاڵی پەرێشان، مەپرسن ئامان
چەرخی چاوانی، سەریان لێم شێوان

***



کۆچ کە سا وە خەێر مەنزڵ بەمەنزڵ
تا هەوارگەی خۆت گەرمیانی دڵ
لە وەزگەی جاران قەت نەبی غافڵ
ئامان سەد ئامان، حاڵی پەرێشان، مەپرسن ئامان
چەرخی چاوانی، سەریان لێم شێوان

ئەم بەستەیەم بۆ نەواییێکی کرماشانی سازکرد، ئەڵبەت بەیتی (گیان...) فۆلکلۆرە لە تاریخی ۱۰/۱۱/۱۳٤۳ ھ.ش. خوێنرا و تۆمارکرا.

## مەلی شکارچی

مەلی شکارچی، بازی دڵڕفێن
ئێسکسووک، تیژباڵ، یاری خوێن خاوێن
گیان، گیان، گیان و گیان گیان ئازیزەکەم
میوانی نازدار «گیانە»، شەو پاییزەکەم

***

لاشەی بێ گیانمت کردە لوولەی نەی
بانگی ئاهەنگم، «هەی دڵ» و «وەی، وەی»
گیان گیان، گیان و گیان، گیان ئازیزەکەم
میوانی ئازیز «گیانە» شەو پاییزەکەم

***

کەللەی کۆم چەرمووی هەوری دەروونە
سیروانی دیدەم سەرچاوەی هوونە
گیان گیان، گیان و گیان، گیان ئازیزەکەم
میوانی ئازیز «گیانە»، شەو پاییزەکەم

***

ئەی سوب دوو کۆتر وە یەک مەکوکان
مەوت لەی دونیا ئێمەیچێن میوان
گیان گیان، گیان و گیان، گیان ئازیزەکەم
میوانی ئازیز «گیانە» شەو پاییزەکەم



## صەبرییە

مەزهەری خالقی لە ۲۹/ ۱۰/ ۱۳٤۳دا بە نەوای نەرم و گەرمی خوێندی و تۆمارکرا

صەبرییە! هەستە بەیانە
ئێوارە خەنەبەندانە
گیرۆدەت دەردی گرانە
بۆ تۆ حاڵی پەرێشانە
ئامان، ئامان، ئەی صەبریە
کوشتوومی و ئاگای لێم نییە

***

ئەمزانی خوازبێنی ئەکرێ
نەمزانی شیرینییش ئەخورێ
وتیان سەبری بەم زوو ئەبرێ
لەسەر دڵما بوو بە گرێ
ئامان، ئامان، ئەی سەبرییە
کوشتوومی ئاگای لێم نییە

***

فرسەت کوا؟ چارە جۆبی کەم
شەرحی عیشقی خۆم بۆ کێ بەم
چارەم چییە، ئەبێ چی بکەم؟
خوا بتگرێ من چۆن دەربەم
ئامان، ئامان، ئەی سەبرییە
کوشتوومی و ئاگای لێم نییە

***

صەبری بەچاوی مەستەوە
بەدوو ئەبرۆی پەیوەستەوە
منی هەژاری بەستەوە
دڵی نام بە سەر دەستەوە
ئامان، ئامان، ئەی سەبرییە
دەمکوژی و ئاگات لێم نییە

## ئامینێ

«کاک مەزهەری خالقی خوێندی»

ئامینێ! ئەتو دینێ، من دینێ
ئامینێ! بە هەردوومان سەرینێ
ئای هاوار، ئازیزم
وا وەرە ئامینێ
عاشقی باڵای ئامینم
بێ وەفا نامدوێنێ

***

ئازیزێ! شادییە و، هەڵپەڕینێ
ساز نییە بێ تۆ ئەی ماجەبینێ
ئای هاوار، وا وەرە، ئامینێ
عاشقی باڵای ئامینم
بێ وەفا نامدوێنێ
چی بڵێم، ئامینێ

***

ئای دە بێ! لەنجەیێ، پێکەنینێ
ئاورێ، بوزارێ، دڵحەزینێ
ئای هاوار، ئازیزم
وا وەرە، ئامینێ
عاشقی باڵای ئامینم
بێ وەفا نامدوێنێ

***

مەرهەمێ، بۆ زامی دڵبرینێ
با هەڵێ لێم ئەستێرەی نگینێ



ئای هاوار ئامینم
وا وەرە ئامینێ
عاشقی باڵای ئامینم
بێ وەفا نامدوێنێ

***

دلبەرێ! دڵدارت کەی ئەبینێ
لەگەڵتا دوو سەر لەسەر سەرینێ
ئای هاوار، ئازیزم
عاشقی باڵای ئامینێ
لەگەڵتا شەرمینێ
سەرکەینە سەر سەرینێ

***

ئامینێ! تۆ دینێک و من دینێ
ئامینێ! بە هەردوومان ئایینێ
ئازیزم! تۆ لەنجە و پێکەنینێ
ئاواتم من سەما و هەڵپەڕینێ
ئارەزووم تۆ چۆپی، من ڕەقسینێ
ئامینێ تۆ لەنجە و من ڕوانینێ

***

ئا وەرە! بەزمێ بگرین بۆ ژینێ
تا ئەبەد بەس بێ بۆ دڵ غەمینێ
ئا وەرە سەرکەینە سەر سەرینێ
ئامینێ! بە ئایینێ ئەوینێ
ئامینێ! لە من دینێ تۆ دینێ
نازدارێ! بە هەردوومان سەرینێ

## چیت له من داوه

تو خوا پێم بڵێ چیت له من ئەوێ
نایێڵی تاوێ دڵم بسرەوێ
سەرم له تۆ سوورِ ماوه
دڵم زاره، شکیاوه
سەرگەردانم، نازانم
چیت له گیانی من داوه
بۆچی ئارامی گیانم
ئەمەدەی بەدەم بەڵاوه
بۆ مەیلت لێیه، دڵم زامار بێ
خوێنی لێ بتکێ و لەتار لەتار بێ
دامام به دەستی مەیلی غەریب و هەواتەوه
حەزت له خوێنی ئاڵه که بیدەی به پاتەوه
چی بکەم بەدەستی هەوا و لەنجەیی ڕەعناتەوه
خواهانی خوێنه به ناخوونی غونچەساتەوه

***

سەرم ئەنێیه سەر ڕان شل و مل
تا سەر کا له چاو ئەسرین تلاوتل
ڕەنگین کا به ئەشک ڕەنگینی کۆشت
گوڵی کا کالا و گشت باڵاپۆشت
کەواکەت گوڵناری کا
گوڵ گوڵ و خوێناوی کا
بەش باڵات دار و گوڵ بێ
مورادی تۆ حاصڵ بێ
جا گۆنات له گوڵ جوانتر ڕەنگ ئەکەی



کوڵمت شیرینتر ئارایش ئەدەی
دامام به دەستی مەیلی غەریب و هەواتەوه
حەزت له خوێنی ئاڵه که بیدەی به پاتەوه
چی بکەم به دەستی هەوا و غەمزەیێ ڕەعناتەوه
چەن شیکه خوێن به ناخونی جوانی غونچەساتەوه

ئەم بەستە سازکراو، مۆسیقای بۆ ئامادەکرا، بەڵام نەخوێنرا، چونکە من چووم بۆ سەفەر، ئیتر پاشان هەرزی نەکەت بخوێنرێ.

## گوڵ بەدەن

ئەم بەستەیەم سازکرد، بڕیار وابوو (تەهماسبی) لەسەر سەبکی ( **گول آمد بهار آمد**)ی خانم (پوران) بیخوێنێ وە خوێندی. ئاهەنگەی دروست خوێند، بەڵام لە بەستەکەدا هەڵەی زۆر کرا.

گوڵ بەدەن، نەرمۆڵە تەن، مەم وەک شەمامە
بمدەرێ غونچە گوڵێ، ئەومە مەرامە
یارەکەی سەرمەستەکەی، باڵا نەمانە
ئاه، ئاسکەکەی، کەژاڵەکەی، شیرین خەرامە
نازەکەی نازارەکەی، نازک و نازارم
بۆ دووریت، دیدەکەمی، دڵ بێ قەرارم
یارەکەی سەرمەستەکەی باڵا نەمامە
ئاه، ئاسکەکەی، کەژاڵەکەی، شیرین خەرامە

***

لێتم ئەوێ زەردەخەنەی لێوانت
دەی وەفا کە، سا وەها کە
ئەی پەری نازی بەهەشتی، سەیری من کە
بووکی ڕازاوەی سروشتی! سەیری من کە
نازەکەی نازارەکەی، ناسک و نازارم!
بۆ دووریت، دیدەکەمی، دڵ بێ قەرارم
گوڵ بەدەن، نەرمۆڵەتەن، مەم وەک شەمامە
بمدەرێ غونچە گوڵێ، ئەومە مەرامە!

***

شێوە خۆش، تاسە خوارم، مایەی ژیانم
مەمکوژە! بملاوێنە! ئارامی گیانم



باغی دڵداریم بەری هێنا بەرێ
جووتە لیمۆی زەردی نارەستم بەرێ
شێوە خۆش، گوێ لە من کە، مایەی ژیانم
مەمکوژە، بملاوێنە، ئارامی گیانم

## جێ ژوان

چ خۆشە زەمزەمەی دۆسی
بە دڵپاکی لە جێ ژوانا
لەگەڵ یارا دەسە و مل بی
لە بن بەردێکی کوێستانا

***

پەنا بەردێکی کۆساران
بە سەد باغی بەرین نادەم
چ خۆشە بیم و دڵخورپێ
لە ئایینی دڵی جوانا

***

فیدای بیم و مەترسی بم
خودا چەن خۆشە ترس و لەرز
لەگەڵ یارێکی شەرمینا
شپرزابێ لە شەرمانا

***

خودا ئەو هەستە چەن جوانە
کە ناوترێ بە دەم هەرگیز
بەڵام هەستی شەشەم دەرکی
ئەکا گاهێ لە چاوانا

***

ڕەقیب کۆشک و سەرا بۆ تۆ
من و کوێستان و بن بەردێ
بە شەرتێ تاک و تەنیا بم
لەگەڵ سەولی خەرامانا



## عیشقی وەڵات

«کاک مەزهەری خالقی خوێندی»
بە سەودای عیشقی دڵ پڕ خرۆشە
وێنەی پەروانەش پڕووزان خۆشە
عیشقم خاوێنە، دڵم، پڕ جۆشە
ئەو عیشقە عیشقی وەڵاتە (٣ جار)
ئەی وەطەن ڕۆحم فیداتە (٣ جار)

***

نەسیمت بێنی عەتر و عەبیرە
دیمەنت جوان و خۆش و دڵگیرە
زیخت دانەی دوڕ، خاکت ئەکسیرە
ڕەفیقان بەخوا وەڵاتم جوانە (٣ جار)
بەهەشتی کوردە ئەم نیشتمانە (٣ جار)

***

بولبولی باغی مولکی کوردانم
کاوە ئایینم بۆ نیشتمانم
بۆیە خۆشخوێنی خێڵی کوردانم
ئەی خوایە ئەم خاکە چەن خۆشە (٣جار)
ئەو شکڵە نەخشی سرۆشە (٣ جار)

***

شەرتە تا ماوم تۆم لە تۆی دڵ بێ
تۆیێ ئەر بێ تۆس ئاوێتەی گڵ بێ
لەو خوایەم ئەوێ دوچاری چڵ بێ
ئاریاییم شێری کوێستانم (٣ جار)
بولبولی خاکی کوردانم (٣ جار)
ڕۆژی خۆی مەردی مەیدانم

## تیشکی ئاسۆ

لەساڵی ١٣٤٥ی ھ.ش. ئەم بەستەیەم دانا. ئەبێ ئەوەش بڵێم کە دووجار ئامادەم کرد، وە ئەمەش دووەمەکەیانە و، پێشم وا نییە خوێنرابێ.

بێ شنەی نەسیم سروەت بسرەوم
ئەر حەرام نەبێ خۆراسم، خەوم
یا خوا نەمێنم، یاخوا نەمێنم

***

بەر نێشی تیژی سەر خەنجەر کەوم
بەر مەودای بوڕڕای دەم نەشتەرکەوم
یا خوا نەمێنم، خوایا نەمێنم

***

تیشکی سەر ئاسۆت هیوای ژیانم
نەسیمی سوبحت ئارامی گیانم
ئاوا بێ یا خوا، خوایە ئاوا بێ

***

سەرم بە سەر گەرد گەردی دەشتت کەم
دڵم بە قوربان گوڵ گوڵگەشتت کەم
خوایە نەمێنم، یا خوا نەمێنم

***

من شەیدای جوانیی ئەم نیشتمانەم
من بە فدای هەوای ئەم خاکە جوانەم
یا خوا ئاوا بێ، یا خوا ئاوا بێ

***

تافی سافی ئاوی کوێستانت وەتەن چەن دلبەرە
سووسەیی شەو بای نەسیمت میسک و عوود و عەنبەرە
نامەوێ موڵکی جیهان و ژینی دایم عومری نۆ
تاکە ئاواتم سەر ئەفرازیتە بەو خوای بان سەرە



## تنۆکێ شەونم

«ئەم بەستەیەم لە ساڵی ١٣٥٧ی ھ.ش. لە تاران هۆندەوە، بەڵام بە نەخوێنراوی مایەوە»

تنۆکێ شەونمی زەراڵ
لە سەر پەڕەی گوڵێکی ئاڵ
وا خەیاڵم ئەپەرزێنێ
هۆشم لەسەر خۆم نامێنێ
ئەمباتە دونیاییێکی تر
ئەمخاتە سەوداییێکی تر
یا گوراڵەیێ چکولەو خودڕوو
کە بە دەم باوە بێتە هاتوچوو
ئەمخاتە یادی باڵای نیگارێ
شۆخێکی سەرمەس، خۆش لەنجەولارێ
جوانیی تەبیعەت لای وردەبینێ
نازک خەیاڵێ یا پڕ کەماڵی

***

تنۆکێ شەونمێ زەراڵ
لەسەر پەڕەی گوڵێکی ئاڵ
یا گوڵێکی زۆر چکۆڵە
لەسەر لاسکێکی ناسکۆڵە
کە شین بووبێ لە کێو، خودڕوو
بە سروە دێتە هاتوچوو
ئەمباتە دونیاییێکی تر
ئەمخاتە سەوداییێکی تر

***

ئەو ئەڵێی ئەشکی دڵداره
لەسەر ڕووی یارێ ئاواره
ئەم ئەمخاته یادی یارێ
خۆش خەرام و لەنجەولارێ
ئەم سروشتی لە لا جوانه
هەمووی ئیمایه و نیشانه
هەر گۆشەیێ لەم جیهانه
ڕازانی تێدا پەنهانه

***

جووانی تەبیعەت لە هەر دیارێ
ئەمخاته یادی خۆش لەنجەولارێ
سەرنج ڕاکێشه بۆ ورده بینێ
جوانی هەست ئەکا و ئامانجی کارێ
هەر باغێ پڕ گوڵ، هەر لالەزارێ
ئەمخاتەوە بیر چاوی عەیارێ

***

تنۆکی شەونمی زەراڵ
لەسەر پەڕەی گوڵێکی ئاڵ
وا خەیاڵم ئەپەرژێنێ
هۆشم لەسەر خۆم نامێنێ
ئەمباته دونیاییێکی تر
ئەمخاته سەوداییێکی تر

ئەم بەستەیە ئاخرین بەستەیێ بوو، کە لە ئێراندا هۆندمەوه



## ئامنه باڵا بەرز

ئامنه باڵا بەرز، «خوێن شیرین»، ماڵ وەبەرزەوه هاتمه ئاسانەت، «نازەنین»، بەدەم لەرزەوه تاقەتم تاق بوو، «سەربەناز»، دڵخوازی کۆنم له دڵ بیرسه، «ئێستاکەش»، له، دووریت چۆنم خێڵی خاڵخاسان، «خاڵ ماوی»، گا، وه بارەوه چوونۆ بۆ قشلاخ، «شۆڕەژن»، له هەوارەوه زەمزەمەی زەلان، «واشەچاو»، بەرزه ئێلاخان ئێلچیی سپای خەم، «سەرخێڵ گیان»، باهووه و بۆران گیڤەی تەرس ئاوەر، «چاو کەژەڵ»، شەو بای دۆڵ و شیو کوورەی تەمەرێز، «باوانم»، سەریاڵ دیواندیو تکای کۆچی خێر، «نۆنەمام»، خانمی خێڵانه کۆسالان زوقمه، «گیانەکەم» وادەی شامیانه ئەمنەی چاو کەژەڵ، «خاڵ ماوی»، سۆمای چاوانم مەلوولی، دووربای، «بۆیه وا» ئاور بە گیانم ئەمنەی باڵا بەرز، «ئەی هاوار»، چی کزت کەردەن ماچی براڵەکەی، «دووربانێ»، نۆخەتت مەردەن وه فەرمانی کۆچ، «ئازیزم» تۆ خانمی حێلان زین کەن عوبەیده و «کەحیلەی»، پۆلخی ئێلاخان ژێر ماڵەی خاتوون «خاڵخەنەین» بجوێ سەحەردەم بۆ بەدرەقەی بێن «خانم گیان» کۆچی لەیل کەڵ ڕەم ئەمنەی باڵابەرز «نۆ نەمام»، قووتی ڕۆحی من دەی لام لێوه کە «خەم خەیاڵ»، با دیق کا دوژمن

## عابیدا!

عابیدا، گەر ڕاست ئەڕۆی، عەشقێکی بێ پەروات هەیە
کاتی تەنیایی، بەڕاستی، ڕاست ئەکەی، سەودات هەیە
بۆچی وا هێندە ئەکەی تاریفی ڕیش و پەشمەکەت
گەر ئومێدی سەرفەرازیی مەحشەر و «عوقبات» هەیە
بۆچ ئەوەن خەڕڕەی بە نوێژی نارەوانی پڕ ڕییا
گەر درۆ ناکەی، خوداناسی، لە دینا لات هەیە
گەر نەبی گەردەنکەچ و «بێ من لە بازاڕی مەتا»
پووچە کاکی خۆم، ئەوەندە ئیددیعای تەقوات هەیە
تۆ وەرە، سەر کز کە ئامان، لێ نەدەی لاف و گەزاف
ئەر تەماداری گوزەشتی ڕۆژەکەی ئەولات هەیە
تا نەسووتابی لەناو کوورەی کڵێ میحنەت بە سۆز
نارەسی، ئاواز یێکی ناهەق و ڕێسوات هەیە
تا نەبیتە خاکی بەرپێی کارەوانی مەعریفەت
کەی لە کۆڕی ذیکری ڕیندا کەوکەبە و دەستگات هەیە
کێ وتی عاریف ئەبێ لنگ دا بە جاهیل بۆ درەم
دەک خەجاڵەت بی، نییازی میکنەت و غەوغات هەیە
موختەسەر تا دڵ لە بۆتەی زەڕگەریدا قاڵ نەکەی
کەی لە جەرگەی پاکی وانا مەنزڵ و مأوات هەیە
بێ گرین و ناڵە ناڵی پاکی تاکی نیوەشەو
کەی لە بەزمی عەیش و نۆشی عاشقا ڕێگات هەیە
ڕێگەکەت گۆڕیوە عابید بۆ ترازاوی لە ڕێ!
ئەر لە بازاڕی حەقیقەتدا، دڵێ شەیدات هەیە
تۆ وەرە ملکەچ بە (هێژا)! ئەر خودا ناسی بە ڕاس
گەر نییازی بەخشش و ڕێدانی بەردەرگات هەیە



## بەزمێ

هام دەردان بەزمێ، هام فەردان بەزمێ
نەوایێ، نایێ، غەوغایێ، نەزمێ
سەدایێ، سازێ، ئاوازێ ڕازێ
نەوای دڵ پەسەند، دەروون نەوازێ
بەربەیۆ جە نای هەناو پڕدەردێ
سۆزەی هێنا سۆز، یا ئاهی سەردێ
گەردانێ، ناساز گەردوون هاڕایێ
جەور و زەمانەی مازی ماڕایێ
هو پێکۆ وە دڵ، دڵ پێکۆ وە چڵ
ئارام دۆ ئەروا، وە نەوای هەی دڵ
تا نیشۆ نە کان دڵەی پڕ دەردم
زاخاو دەرۆوە خەزانەی فەردم
جۆ شیۆ خرۆشیۆ، گەوهەر فشان بۆ
ژنیەیش گەوارا، ئارامی گیان بۆ
ڕشتەی مرواری ئەسرینان ڕێز بۆ
دەروون کاوون بۆ، قیامەت خێز بۆ
جا وەش سەدایێ وانۆوە فەردم
ڕازانی دەروون مەکۆگای دەردم
وە نەوای هەی دڵ، هەی چڵ، هەی بولبول
باوەڕۆ وە کوڵ، تیکلەی تەنگی دڵ
باوەڕۆ وە ڕقس فریشتە بەرین
شاهیدان واچان سەد جار ئافەرین
عابیدان (هێژا) جە دەیر بان وە بەر
پەرێ خومخانەی خاڵ خاسان یەکسەر

## عیشقی حەقیقی

که من مەملووک و لاکەوتووم لە ژینی خوسرەوانیم چی
لە بەزم و عەیش و ئاهەنگی غەرامی نەوجەوانیم چی
تەریک و بێ دەروبانم لەسەر عەرزی سولەیمانا
لە قەسر و تاق و ئەیوان و لە کۆشک و ئاوەدانیم چی
کە من شیرین تەرازو سایە پەروەردەم لەدەسدا بێ
لە لەنجەولارەو و عیشوەی نیگاری گەرمیانم چی
کە من یاری وەفاداری «بەهارستانی ژینم» چوو
لەدووچوونی مەلەک سیما و فریشتەی کامەرانیم چی
کە من فەرمانی کوژرانم لە دەسگای دڵبەرۆ دەرچێ
لە عەیش و نۆش و تەفریح و حەیات و زیندەگانیم چی
کە مەحرووم مام لە شانازیی ڕەفیقی گوڵعوزاری خۆم
لە سەیری نەخشی شیرینی بوتی دەسکردی مانیم چی
ئەگەر تەسلیمی فەرمانی وەفای یارانی سەرمەس بم
لەسەرمە بمە قوربانی، لە ژینی جاویدانیم چی
دروشمی عیشقی لاهوتی و حەقیقیم پێوەبێ ئیتر
لەسەودای بەزمی ناسووتی و مەجازیی پووچ و فانیم چی
کە من پیری موغانم ڕێنومای ڕێگای تەریقەت بێ
ئەبێ شۆڕو نەوا بێژم، لە سۆزە و ڕەوزەخوانیم چی
بزانن چاکە یارانم کە (هێژا)ی شۆڕشی عیشقم
نییازم کوا بە جامی مەی، لە بەدمەستی و ئەغانیم چی



## پەشێو

سالّی ١٤١٠ هـ.ق.

مەکەن لۆمەم پەرێشان و پەشێوم
مەلوولم، باری غەم سەرباری لێوم
ڕەفیقان! دڵ شکەستە و بێ قەرارم
سبەینێم ئەشکی خوێن و، شینە شێوم
جیگەر بوریان و سەرگەردان و وەیلان
بیابان گەرد و هەردەی دەشت و کێوم
کەسوکار کوانێ؟ تیاچوو، بێ کەسی خۆم
کەساسی ناکەس و خوێنخوار و خێوم[١]
دڵم پڕ سۆیە سووسەی لێ بڕاوە
لە چنگی ڕۆژگارا مشتێ مێوم
ئیرادەم کوا؟ بڕاوە لێ بڕانم
شەمم، بازیچەیی ئەمیالی دێوم
ئەوی وا دوژمنم پێی خۆشە وامە
بە حەق شایستەیی تانە و جنێوم
ڕەوایە بۆ بەسەرهاتی زەبوونم
بە هەردوو دەس لەداخا قوڕ بپێوم
بەداخۆ کوێلەییمان گرتە گەردەن
بە دەم تا کەی بڵێم میر و خدێوم
ڕەوایە دوژمنم پێی وابێ مەنگم؟
دەبەنگ و سارد و سڕ، وەک بەرد و چێوم
هەمووی (هێژا) خەتای بێحاڵیی تۆیە
ئیتر هەرگیز مەڵێ وریا و بزێوم

## کەمەندی یار گیر

کە تۆ یاری دڵی شەیدای، لەگێتی و خەڵکی چیت داوە
دڵم لەو ڕۆژەوە تۆی دی، لە عالەم وازی هێناوە
کەمەندی زڵفی یار گیرت، لە دەوری گەردەنم ئاڵا
ئیتر چیی دیت، دەوێ کاتێ دڵم لای تۆ بەجێ ماوە
لە سەیری گوڵشەنی گێتی و لە گەشتی سەرسەراوم چی
کە من شەیدای مەحەببەتم و، دڵ و گیانم بە تۆ داوە
مەڵێن سەرسام و داماوە، چلۆن حاڵم لەسەرخۆ بێ؟
دڵ و ڕۆحم گرەوگانە، بە لای دڵخوازی ڕەعناوە
بە چەشنێ نوقمی عیشقی دڵستانی جوانی غەددارم
لە عالەم پەرتم و وەیلان و، نازانم چ قەوماوە
بەڵام لەولاوە سەیری شۆڕش و غەوغا و قیامەت کە
لە خولدان موطریب و ساقی و پەری و حوور، دەس بە صەهباوە
لە جەرگەی بەزمی مەستان دەس بە جام و مەست و خەندانم
بەسەر تەختی ئەوینۆ، دڵنیام و خوم نەشێواوە
ڕەفیق! تۆ کەی ئەزانی دەوری جەمگای خوم چ بەزمێکە!
لەوێ ڕووخاوە قەلعەی غەم، خەفەت بەربادە، فەوتاوە
بڵێن سەوداگەرانی غەم لەلای من کۆوەبن سەرجەم
کە پێیان موژدە دەم یەکدەم عیلاجی هەردە ناسراوە
ئەوین و خۆشەویستی لێبووردن مەستی یو بڕوا
لە خومخانەی خەما تێکەڵ کە بوو نۆشدارووی ناوە
ئەوی «هێژا» بێ تیماری هەموو دەردێکی ئاسانە
خەیاڵی تەختە، یەکڕەنگە، دڵی هەرگیز نەگۆڕاوە



## لێوە

دڵەی دێوانەم لێویان، لێوە
شێوەم شی جە دەس، مەندم بێ شێوە
عەقڵ و فام و هۆش نەزاکەت وییەرد
چی تەشریف ناوەرد یارەکەی هەم فەرد؟!
ئەر بێ وە سەرکۆی گڵکۆی مەزارم
مەوینۆ کە مەس بادەی خەممارم
سەنگ و بەرد و گڵ کێل قەبرم مەست
چەمەڕای ڕاچەم تا ڕۆکەی ئەلەست
ها دیدە، دیدەم چەمەڕای ڕاتەن
جەواهیر سورمەش گەردی پاڵاتەن
تاقەت نەمەندەن، شەکیبا و تاکەی
ناڵەم بەرنمێ، وەی وە یانەم وەی
دڵ ماڵ وێران بۆ من چێشم کەردەن
هەی هانا، هەی داد، مەیلت چی سەردەن؟!
هەرچێ هەم، ئازیز! گرۆی ئاسانەم
دەی بەزەییت کۆن؟ هەرەس وە یانەم!
نەفیری دەروون وە فەڵەک یاوان
سەماو زەمینش گردین شکاونان
چی گۆشێ مەدەی، چی دەنگت نییەن؟
هەرەس وە یانەم یانێت نەژنییەن؟
سا هانام وە تۆن یاوی وە هانام
هەر تاوانێم، هەن وەس بۆ، نەزانام
ئازیزم، دیدەم بەندە و بەردەی تۆم
نە خشتە بەردەی مەردەی کەردەی تۆم

ڕۆی ئەزەڵ چەنگەک نە دڵ گیر کەردی
چی شەرتی وەفا بە جا ناوەردی؟
خەستە و پابەستەی کەمانت کەردا
ئیسە چیم مەدەی وە دار و بەردا
وە تێغی ئەبرۆ سینەت شکاونا
نە کانی دڵدا خاس وێت ساونا
ئێسە چی مەدەی ڕەنج و شکەنجەم
یانێ های ماچی من قەوی پەنجەم؟
ئا وەختە زانام کەوتا وە دامت
نە یاوام وە مەیل وە کامی کامت
وە گیانت قەسەم (هێژ)ا نە زارەن
غەرق دەریای گێج خەم و پەژارەن



(..............)

نەواچدێ کوردە نادان،ا مەزانۆ
کەسێ عەقڵش جە کۆن وەختێ نەوانۆ
بڕێ چێوێ هەنی وێ تەن مەزانیا
چەنی شۆتۆ ئەدێ زاڕ و ونار نۆ
غەریزە بێ موتاڵا و دەرس و مەکتەب
جە پەهنا و ئاوەزی تۆمش مەشانۆ
دەروونی پەڕ کەڕۆ، ڕای قوڕس و مەحکەم
بەئاسانی جەدەست و تۆ مەسانۆ
پەیامێ مەحرەمانێ توۆ دەروونی
بە بێ سیم و تەل و ڕایەڵ کیانۆ
بەبێ ئانەی بزانی چێش نیازەن
برووسکێوەن جە بەرقێ مێو مەشانۆ

## شەماڵ

شەماڵ سا وە شنۆی عەنبەربارەوە
وە صەفای سروەی وای وەهارەوە
وە هەوای سۆزان سینەی یارەوە
وە بۆی گوراڵان گەرمە سارەوە
شنیە، وێت ئاسا، سا بۆ وە پارێز
بارە عەترێ خاس موشکی عەنبەر بێز
موشکین ئەگریجان، ئاهووانی دەشت
بەیان، سەفا دان ئێلاخ چون بەهەشت
شەماڵ! «زمناکۆ» ڕەنگ ئامێزی کەر!
ڕیشەی کرێڵەش بەربارە وە بەر!
چەپکەی لانزار کەفەن پۆش کۆ
کەر وێنەی ساکۆی دەوری «زمناکۆ» !
چاگەیچۆ خیزیە ئارام وێنەی وێت
کڵاوەی «بەمۆ» سەردی شێت و وێت
وێنەی «کارگەچی» «کۆڵ و کرێڵان»
شیکەر وە زۆری زرمەی ژی کەمان
خاس دەش وە هەمدا تا مەبۆ وە ئاو
بەیۆ نە سەردا ڕێزۆ نە شەتاو
جا بۆ سەرازێر شنەت بێ شنیە
وە بێ مودارا زوو چا هۆرکنیە
پابۆسێ نە کۆی پیرەمەگروون کەر
زیارەت قەبوڵ، جا ڕا گیرە وەر
گوزەرکەر وە دەشت «شارەزوور»ەدا
وە سارای «بڵواس» «باوەنور»ەدا



وێت یاونە یەکسەر وە کۆکەی «پیران»
ماوای کەڵ ڕەمان خێڵ نەخچیران
تا یا وی وە بان کڵاوەی «وەیسە»
ئا هەردە گردین بییەن وە «بەیسە»
بەیسەش تا تاوی تاونۆ وە تەعجیل
کەڵ نە کەڵ لانان ماندەن وێنەی دیل
با بەربەیانێ کەلانی سەربەس
ذەلیل نەبانێ بەرنەشان جە دەس
جە غارێ تاریک وێنەی کابووسگا
ئازاد بان، بلان شاد بە «جاسووسگا»
نە «کەڵ لانان»ا نەبانێ ماتەم
ساتێ وە تۆ دان پەرێ وێشان غەم
(تا وێنەی ئێمە نەگێران عادەت
قەبووڵ نەکەرا دیلی و ئەسارەت)
جا بارە باڵێ وە «میراجی»دا
وە کۆسارانی پشتی «ساوجی» دا
وێنەی کارگەچی کولووی کرێڵان
شی کەر وە لەرزەی شنەت چون کەمان
جا سۆزەی سۆزت بدۆ نە «سۆزان»
سووسە نەماندەی کۆگای کۆی بۆران
گێرە ئا بەندەن ئەم یاڵ و ئەو یاڵ
وە بێ مودارا شانە پەی وێت باڵ
«مڵەخورد» تاریک، سەرتاپا ماتەم
گرتەن سەرکەللێش بۆران چەنی تەم
وە تاو بۆ شنیە پا کۆسارەدا
بە بەرزی و نزمی و دۆڵ و غارەدا

سا دەش وەهەمدا کەرەش وێنەی هەڵم
با نرکەش هۆزۆ نە سەرچەمەی زەڵم
جا چایچ هۆرێزە بە وێنەی «شمقاڕ»
دە نە شەقەقەی باڵ تا وە «کەماجاڕ»
جا ڕێی کریلان ماڵە وە هەڵمەت
با نرکەش بێ سێڵ جە دەرەی «سەرگەت»
«وەزەڕا» بەستەن، سەرکۆ بەندکەردەن
قافڵەی ماوەشان بێ ڕاگە مەندەن
ڕا مە دۆ وە خێڵ «قافڵە سالاران»
بەیان وە کویسان چون جاری جاران
بۆ سا وێت ئاسا وە بای فەناش دەر
واچە ئەی خود سەر ڕاگە هالی کەر
تەتەیچ قەهارەن، ڕازنان کریلە
کلاوەش کەردەن چون قولەی هێلە
ڕاگەی مەل نییەن بویەڕۆ پێشدا
«دالی» چاڵ و چۆڵ نەمەندەن تێشدا
بۆ کەرەش وە کەف تل بدۆ جە وێش
بە وێنەی بیمار لاشە کەرۆ کێش
هەرەس ماڵ کەرۆ کەرۆش وە گرمە
جە دەرە و «بیارێ» هۆرێزنۆ زرمە
ئا دەرە تەمام گرد وێشان جەم کەن
«کەیمنە» چەنی «بێدرواس» ڕەم کەن
«هانە گەرمەڵە» جە هاڕەش کەڕ بۆ
بای سێلاو وێنەی بادی سەڕسەڕ بۆ
وە سروەی مەخسوس گیان بەخشەکەی وێت
ڕازنۆ کەش و کۆش، گێرە ڕاگەی وێت



وە سروەی وەش بۆ سارا گێرە وەر
وێت یاونەوە کۆی پشتی «دزاوەر»
چاگەیچە کەرەش وە کارەساتێ
تل و ئا کەشیە یاوۆ «گەڕیات»ێ
هەرەس ماڵ کەرۆ ئا کەش و ئا کۆ
بەرگنۆ تەمام ساکۆی سیاکۆ
چووزە بەر باران گیاهان کۆ
ڕازناوە وێشان «چنوور» و «شەوبۆ»
جا نە قەڵاکەی هەورامانەوە
ئا کەشی سەربەرز بێ ئەمانەوە
کێشە وە ئارام بێ دەنگ وە ئاسەم
تا یاوی وە بان بەرزیی «پیر ڕۆسەم»
«کەمالا» ماتەم، «وەیسیا» بێ دەنگ
«سەرپیر» کشومات، کۆسار گشت یەکڕەنگ
سەرازێر شنیە بەڵام وە تەعظیم
پەی مەنزڵگای خاس پیرانی قەدیم
نەوەد و نۆ پیر خاکی هەورامان
واچە (السلام) ئەی گڵکۆی پیران
جە گەر مەسارۆ ئامانا وە تاو
وەروە و ئی کەشیە زووکەرو و وە ئاو
کریلە و باهوو نە زارش کەم پاک
باهو و وەش وێنەی یەخەی شێت کەم چاک
تا بەرگنۆوە ئەز نۆ بەرد و خاک
گوڵان بەربەیان، نەبانێ غەمناک
جا دما و ئانەی وە بێ مودارا
هوو پێکە وە ناو کەش و کۆو سارا

وە هەوای نەفەس عیسا ئاساوە
کەشان زیندەکەر، وێشان ڕازناوە
کارەڕەهاتێ باوەر وە مەیدان
ئاواز بەربارۆ هەر مەلێ شەیدان
پۆشۆ کۆ وێنەی عەرووسان تارا
بدان وە سەردا سەرپۆشی خارا
دێبای زەرد و سوور ڕەنگا و ڕەنگ پۆشان
وەرواوی لەتیف پای وەروان نۆشان
جا یاوۆ وادەی سروور و شادی
بەخشە وە دیلی کۆسار ئازادی
«وەیسیا»و «کەماڵا»و «ڕوو وەرێ» و «بندۆڵ»
«شاری هەورامان» دەگا کەران چۆڵ
زارولێ و لاوێ و جاهێڵ، جوان، پیر
کێخا و خان و بەگ، ڕیش چەرمەو گزیر
مالان وە یاسای قەدیم سەری پیر
شاد بانێ گردین، کەس نەبۆ زویر
زەماوەندی پیر وێنەی هەر ساڵە
وە دەس گەل کەراش وە قوولە و گاڵە
شەتاو و «هانەجەمە» قرمەش بێ
تاف و قەڵوەزەی «سلۆر» زرمەش بێ
هەزار وە هەزار تافی «مارانی»
کەف و جۆش و قوڵ «حەوش و بەدرانی»
«دەرەویان» ڕەنگین وێنەی کۆی «ڕەنگین»
تەیار بان، پۆشان ڕەنگاوڕەنگ گردین
ئەلحاسڵ ئەو بەند بە وێنەی جەننەت
کەر وە گوڵستان، جا گێرە ڕاگەت



فیردەوسی بەرین فەراهەم بارە
هەر کەش و هەر کۆ وییەردی پارە
جا پێچیە و لووە پەی وێت کۆبەکۆ
شەماڵ ئامانەن وە تاجیل سابۆ
وێت دەر بە هەرد و بەردی کۆیساندا
یاڵە و یاڵ وە باڵ وە هەوراماندا
کۆکەی «خوێسملێ» ماتەن، بێ دەنگەن
نە بۆی گورالان، نە دەنگەی چەنگەن
وێنەی هەر ساڵە سەفا دەر ئەی کۆ
با بزیۆ «چنوور» ، «وەرکەمەر» ، «شەوبۆ»
«ترشکە» و «تەرلە»و «بەنا»و «هالەکۆک»
«ڕێواس» و خرگای چووزە کەرۆکۆک
«هەراڵەبرەم» «گا و گۆراڵ» وە تەوق
«چنوور» پەرێشان، وەرتاقان پڕ زەوق
«کاشمە» موعەتتەر، «پیچک» نە تاقچە
گوڵی ڕەنگاوڕەنگ تیپ تیپ چون باغچە
«شنگ» و «هاڵەکۆک» بە خەروار و بار
«بەڕەزا» ئەفشان نە سەر تاقی غار
«کەما» و «لۆ» لۆلۆ پێچ وەران وە هەم
«سووره هەراڵە» و «هەراڵەبرەم»
«بەرزە لنگ» وە بۆی عەنبەر ئاسای ویش
تیمارکەرو زام جیگەر خەستە و ڕێش
بدان وە هەمدا گوڵان ڕەنگاوڕەنگ
سەف ئارایی کەن چون باغچەی فەرەنگ
ناو دۆڵ و نەزار تۆی کەمەر گوڵ بۆ
بەهەشتی بەرین پەی ئەهلی دڵ بۆ

جا کەبکان نە توێ سەوزە و گورالّە
کەراش وە چیڕە و وە قیژ و گالّە
ئاوازی بولّبولّ چل بدۆ نە دلّ
وە نەوای دلّدۆز دەوری گولّ و چل
«دوراج» و «قومری» و کۆتری «یاهوو»
وە سەدای ئاواز «یا هو، یا من هو»
سەمتوور و ساز و کەرەنا و شەیپوور
ئەلحانی مەلان بژنەویۆ جە دوور
حەو تاقی ئەزرەق پەڕ بۆ جە سروور
بەیان وە سەما مەلایک و حوور
ئەلحاسلّ بەزمێ خوسرەوانی بۆ
سەرانسەر یەکسەر کامەرانی بۆ
ئەوسا جا گەل گەل پۆل پۆل نازاران
سەهەن پەروەردەی مولّکی ئەورامان
حۆری سروشتان، فریشتانی کۆ
بۆ گرتەی عەتری چنوور و شەوبۆ
بە دەستە دەستە وە عەزمی سەیران
ئاهووانی هەرد بەندی کۆسالاّن
وە عیشوە و نازی هەزار تەرزەوە
وە قامەت مەوزوون بالاّی بەرزەوە
گۆنا پەڕەی گولّ، دەهان چون گولّنار
مەم لیمۆی سەر تەرز چون بوتی بەهار
گەردەن بە وێنەی مینای جامی مەی
نەشئە بەخشی بەزم شازادانی کەی
زلّف وێنەی کەمان، ئەبرۆ وێنەی تاق
بێ وێنە نە سای سایەی حەوت ڕەواق



تالاّنچیی فام و شعووری عوششاق
هۆرجمان، بەیان با وە تەمتەراق
ئەی بۆ، ئەی هەوا، ئەی ڕەوح، ئەی خەسلّەت
ئەی شەوق، ئەی صەفا مەر هەن جە جەننەت؟
ئەی نازک نەوهالّ، ئەی باغ، ئەی گولّزار
ئەی لەحن، ئەی ئاواز، ئەی بوت، ئەی نازار
ئەی سیما، ئەی زەوق، ئەی کەیف، ئەی شادی
ئەی بازاڕ، ئەی بەزم، ئەی وادی وادی
جە کۆ، جە کام شار، کام مولّک، کام ماوا
ماوەردی وە دەس، واچدێش مالّ ئاوا
بۆسا ئەی شەمالّ چون وادەی بەزمەن
نەی دونیا لادێ بازاڕمان گەرمەن
غەم دەیمێ وە باد، شاد شاد پەی وێمان
نە ژێر نەی بارووی پڕ جەوری کەیوان
شەمالّ سا (هێژا) ماندەن بێ قەرار
هەر وە تەماتەن چەم وە ئینتیزار
شینی خوالێخۆشبوو دکتور صدیق مفتی زادە

## هەر خۆی ئەمێنێ

ها لالۆی ئازیز، ئاشنای دەردم!
هام مەرام، هام زام، هام ئێش، هام فەردم!
ئەژنیم هەوالێ ناهالّ و گیان کاو
سەنگین، مازی مارِ، دڵخار، یەهەرتاو
چێش گۆیا وادەی کۆچی یەکجارین
دیدار ئاخیرەت ئامای نادیارین
ئای «زایلّەی زەنگ» کۆچی دوور مەنزڵ
ئای لواو نامای، ورکە و کورکەی دڵ
ئای جەمع و تەفریق، ئای قەیچیی تەقدیر
ئای میقرازی تیژ، بورِڕای بێ تەگبیر
های دەردی کاری، کەسکو، ن، بێ دەرمان
بێ وچان ناسۆر، سۆزان، بێ ئەمان
ئای لوای لالۆ! وەی وێم «بێ وەی وێم»
زار و نەزار و، نالاّن چون نەی وێم
ئای جەی غەریبی موبتەلای وەی وێم
تونای گەردابی دەریای بێ پەی وێم
ئای داد و فەریاد، شیوەن تەنیا وێم
ئای یەهەر سۆتەی پەیوەند بڕیا وێم
یاران! کێ زانۆ چێ دەردم چێشەن
پەی کێ ڕۆڕۆمەن، دەروونم ڕێشەن
تەنیا و تاک پەی وێم، پەی کێ ڕۆڕۆمەن
بێ تۆ، دوور جە تۆ، بێ تۆ، تۆ تۆمەن
چەرخی چەپ! چون من دەی سەرگەردان بی
گەردەلوول وەردەی ڕای عەرەبسان بی



ڕۆیێ گۆی گەردان خول ناوەردەوە
ئێمەیچ لوول نەدۆ، وە دەم دەردەوە
لالۆ! تۆم سپەرد وە فەزلی داوەر
بەخشا، تەوانا، پەنادار، سەروەر
کەسی بێ کەسان نە گەردابی غەم
ڕانمای مانیای، ڕاوەزگەی ستەم
جە وێش مەوازوون وە جەننەت شاد بی
جە گەردابی شووم دەوران ئازاد بی
فریشتانی خاس بەهەشتی بەرین
فیردەوس مەقامان، جیهان ئافەرین
بە یاسای کەرەم ئەی تازە میهمان
گەردی ڕای سەفەر جە جەستەت مالاّن
سەرفەراز وە لوتف ڕەبی عالەمین
بەرات وە کۆگای کۆی شەهید نشین
گرۆی دڵ ڕێشان ئاخ بەردە وە گڵ
نەسرەوتە دەردان، ڕەنجی بێ حاسڵ
دڵ پڕ حەسرەتان ناکامانی دەور
جەستە خەستەگان ماتەم زەدەی جەور
تۆیچ وێنەی یاران (اللە اکبر)
نەوای سکالاّ بەرباردێ وە بەر
بەڵکەم نە سۆزی سینەی خەستەدڵ
حەسرەتان وستەی ئاوات بەردە گڵ
لایێ کەرۆوە کەریمی کارساز
دەرێ پەی ئاوات ئێمەیچ کە ڕۆ باز
تۆماری سیای ستەم پێچیۆوە
نەمامی موراد ئەز نۆ بزیۆوە

کۆس و کۆلارا و کوردیچ بڕیۆوه
ڕای ڕستگاریی ئێمەیچ بێزیۆوه
لالۆ! تۆ لوای، لاو منیچ لاو تۆن
«ئارۆ و سەوایێن» ، سەوایچ هەر ئارۆن
تۆ ئاشنای ڕاز مەعدووم مەولەوی
دونیای پڕ سەفای شیعری مەثنەوی
سەرنییای وه بان سەنگی سەردەوه
وه هەزار ئاوات، چەندین دەردەوه
کێ بێو بشکاوو گوفتاری مەعدووم
کێ ڕێزه کاری و نوکتەش کا مەعلووم
داخی سەد داخم لالۆی زانای وێم
مەر وێم بزانوو چێشت کەردەن پێم
زانای تەوانای وەستای دانیشمەند
ئوستادی دڵسۆز، مەردی خیرەومەند!
قەڵەم زەن، ئەدیب، شاعیری قەدیر
مەولەوی ناسی وردی بێ نەظیر
چێش فەرامۆش کەم لالۆی ئازیزم
هەم صوحبەتی خاس شەوی پاییزم
وتاری نەغزی تەوئەم وه خەندەت؟
سکالاَ جه دەس حاڵ و وییەردەت؟
یا ئاوات وه سۆز پەی ئایەندەی کورد
یا شییه و کەردەی ڕێزەکاریی ورد؟
گردین چۆن تابلۆ نەخشی خاترەن
ویردی زووانی حاڵی حازرەن
واتەم کوتاکەم چێش واچوون کەمەن
کۆچت کۆلاراو کۆگای وەرهەمەن



یادت، لالۆی وێم، نییەن فەرامۆش
پەیاپەی دەروون جۆش مەدۆ وه جۆش
حەرام بۆ جه من سەفای «شەمێران»
سەیرانی «ئەوین» ، «دەرەکەی» تاران
حەرام بۆ گەشتی «دەربەند» و «سەربەند»
نەسیمی «ئەلبورز» ، «تووچاڵ» ، «دەماوەند»
لالۆ گیان! ئەروات وه جەننەت شاد بۆ
ڕۆحت جه سەودای ئاوات ئازاد بۆ
دڵخوازی گردین ئەدیبانی کورد
زانایان، میرزا و سەروەرانی کورد
گرد لوان وه گڵ سەرپاک ئاواتان
گوڵ وه دەم ئەز دەم مزیۆوه دیسان
لالۆم! بێ گومان بەخشوودەی باریت
یاوان بارەگاش زەنای زینهاریت
مێژووی کۆچەکەت (هێژا) وه زاری
کاتی صدیق ڕۆ وه بێ قەراری
ماچۆ دەی بەخشەش به گەورەییی وێت
«کەریم! ئامانه، پەناش ئاردەن پێێت»

---

(٢٧٥ + ٩٨ + ٣٥٨ + ٢٦١ + ٤١٢) ١٤٠٤ ه.ق.

| | | |
|---|---|---|
| (ک ه ری م) | (ا ا م ا ن ه) | (پ ه ن ا ش) |
| (٢٠+٥+٢٠٠+١٠+٤٠) | (١+١+٤٠+١+٥٠+٥) | (٢+٥+٥٠+١+٣٠٠) |
| ٢٥٧ | ٩٨ | ٣٥٨ |
| (ا ا ر د ه ن) | (پ ی ت) | |
| (١+١+٢٠٠+٤+٥+٥٠) | (٢+١٠+٤٠٠) | |
| ٢٦١ | ٤١٢ | |

هەمووی ئەکاتە ١٤٠٤ی ه.ق.

## بەهاری کوردەواری

لاسامەیە. لاتیرە ئەبارێ بە خوڕڕەم و تاو
باران و دودانگ و، بەفرە لووکە و تەرزە
ناهاڵە ناڵە ناڵی ترێشقە، چ زێڕینە برووسکە
بانگی ژیانی نوێیە نرکەیی لافاو
پاسارییە ئەجریکێنێ، ئەچێ، هەڵدێ
ئەخزێتە بن میچ و کڕ هەلدێ
ڕیشۆڵەیی زۆر بلێیە فیرار ئەکا
ئەفڕێ، بەتاو، بەتاو، سەری خۆی هەڵئەگرێ

***

ساوا کە قریشکە قریشکی ترێشقە دێتە گوێی
ڕا ئەچەنی، ئەلەرزێ، دائەچڵەکێ ناکاو
سەری لە سینەیی نەرمی داکی ئەسوێ
بەڵام بە گاڵتە و پێکەنینی گەورەتران
کە کۆن لە دەوری، لەبەر ئەیوانی ماڵ
تێکەڵ بە ترسەوە شیرەبزە، ئەیگرێ
دێتە گڕوگاڵ، چەن جوانە
خوایە! شیرەبزە و ترسی مناڵ
چ جووانە کۆرپەیی پەرزاو

***

وەرن کوڕینە! پەنا بەرینە کێو
سەرێ بدەین لە بەزمی بەرز و نشێو
کەو هەڵئەکاتە فڕگەیی سەرشان
ئەخوێنێ لە بەر بەرۆژی هەردان
ئەدا لە شەققەی باڵ
کە ئەگاتە نزار و یاڵ



ئەملێتەوە، سەرخۆشی بووارە بەها
خۆشکەیفە، ئەچێ بەرەو هەوار
ڕێگای لەپێشە خۆرەتاو و نزار
بەڵام، لاسامە، بە شیپپی تەوەژمی ئەیکاتە بنی کاو
پەکی ئەخا لە هەڵکردن و فڕین
ئەو کاتە دەست ئەکا بە چینەو و خۆچنین
مل کەچ ئەکا لەسەر یەک پا، ئەوەستێ تاوتاو
بولبوڵ چلاوچڵ ئەفڕێت و ئەخوێنێ
کۆرپەی هیوای بەرێوەیە غونچەی نازاو
ئەمرۆ، سبەی، بە دەم شنەی شەماڵەوە، دەم ئەکاتەوە
بزە ئەیگرێ، بە نازەوە لێو ئەکاتەوە
ڕەببی کە جوانە غونچەی تەرچک
کە تازە دەپشکوێ
بەربەیانی بەهار

***

کاتێ کە تاوی بارشی خوڕڕەم بەسەرئەچێ
نەوبەی تەپوڵمە، ئاوێتەیی هەتاو
نەققاشی دەستی تەواناى ئێزەدی
لەسەر سەری نەوعەرووسی لالەزار
ئەستوونی زێڕین و، ڕەنگین کەمانی جوان
تاقی هەزار ڕەنگەو و خێوەتی شاهکار
دێنێتە بەرهەم و، وا بەرێز ئەگرێ
قەدەمی نازەنینی بووکی نەوبەهار
بووکێ کە دیمەنی یاقووت و تەختی زوبەرجەدە
پیرۆزە فەرشیەتی، لەسەری مەست و خومار
دانیشتووە پێ شیاوە کە خێوەتی
زەرپین کەمانێ ببێ و نەخشی کردگار

***

بخۆ، بلەرزەیی ماڵاتە لە بژوێن و لە قەدپاڵ
شۆراوەیە بەرگی بەران و شەکی کاڵ
مووی بزنە مەرەز، جوان و زەریفە بە دانەیی
شانەی تگر، بووەتە خەیاتەیی خاوی ڕەنگ کراو
خاوێن و سپییە بەرگی زەریفی شەکەنێر
ئیشتیبا ئەکا بە چاو
وەک خاڵی بەفرە لەناو سەوزە لە دوورەوە
بەرغەل کە کۆڕ ئەکا، لە تاوی بارشە تەنگەتاو
کاری بچووک و بەرخی بەرغەلی دەمێ
ئەخزێتە ژێری تەنەی درەختی زەلام و قەوی
مێگەل سەران لە بنی دووگی یەکتری
حەشار ئەدەن، ڕێزە دەبەستن
لە تاوی تەرزە مۆڵ ئەدەن ناوناو
مەڕ کاتێ بەفرە لووکە لەسەر پشتی کۆ ئەبێ
خۆ ڕا ئەوەشێنێ لە تاوی بەفرەتاو
چەن هار و هاجە گیسکە نێری خەساو
چەن پڕ شکۆیە مرقە مرقی حەچە
سابرێنی شاخ زەلام
توخوا کە جوانە شەکی کۆکی نەشەمزاو
ڕەبی کە ملهوڕە پارێنی نەمۆچاو
چەن مەست و پڕ غرووره
کەڵی جوانی نەئاملاو

***

چرۆ ئەگەشێتەوە، خەڵفە ڕام ئەکا، ئەزرێ
کاتێ بەئەستەم هەراڵە بزە ئەیگرێ
لەپاڵی حەریری سەوزا خۆی حەشارئەدا



نەوەکو تەرزە بیگرێ
گۆراڵە لاسکی زەریف و تەرجکە ئەمما
کەمێ شپرزەیی لاتیر و سەرما
چاوەنوواڕی هەتاو
ئومێد و بیمە برا جوانە موعەممایی ژین
عومرێکی نوێیە، شۆری مەستییە
حەقیەتی بولبولی هەژار
بەسۆزەوە لەگەڵ غونچە بێتە گفتوگۆ
بە چریکە بانگی بکاتێ
بەڵکو گەرێ لە چاو شارکێ
لە پاڵی پەردەیی حەریری دەرێ
ئەدرێ ئەویش بە نازەوە، بە زەردەخەنە
جوانی ئەخاتە ڕوو
تارا لائەدا، دەردێ
تا شووری مەستی بە ئەفسوونی دیمەنی پتر
بخاتە دەروونی بولبولی هەژاری بێ قەرار
بیباتە بەزمی ئەوین و بەهەشتی پایەدار
بە هەزار ڕەنگە عیشوەگەری ئەکا
بوتی عەییار، بوتی عەییار

***

ئەوسا لەپڕ نەسیمی بەهاری ئەشنێت و دێت
ئەیخاتە سەما، هەراڵە و خامە تووڵ
ئارام و لەسەرخۆ کە دێت و دەچێ
دائەوەرێنێ دڵۆپی بێ شک و گوڵاو
عەترێ ئەدا بە نەسیمی بەیان
تاکو وەری دا، لە دەماخی

سەرما زەدەیی زەمهەریر
هەراڵەیی خەملاو

***

ڕنەی دەواری ماڵە کوردە گوڵاو پاشی خێڵ و هۆز
خرمەی دەواری کەڕە
مووسیقییە، نەوایە، خوایە چ خۆشە
فەسڵی بەهار
چ جوانە نەخشی کردگار!

***

جێژنانەیی سروشتییە نەخشی کێو و شیو
بۆ خاوەنی هەست و دەبەنگ
بۆ مەست و هۆشیار
بۆ مەلی هەژار
نە نە بەڵکو بۆ هەموو گیاندار
وەصفی بەهارە کە ڕازانی خەڵکی گێتییە
هۆنەر بە شیعر و نووسەران بە وتار
پێم وایە، براینە، ڕاستەکەی ئەوەبێ
نایێتە وتن نەخشی کردگار
منیش وەکو خەڵکی ئەوەم کە زانی وتم
لە سەناو و، وەسفی بەهار
ببوورن ئەگەر نارەسایە باسەکەم ، ئێستا وتم
لە وتن نایێ بە نەسر و بە شیعری عەروزی
بە ئازاد و نوێ، تا ئەگاتە وتار

***

عابید! بنووسی ئەگەر دەفتەر و تۆمار
هێمان نەتوتووە یەک لە هەزار



لە وزەی زمان و زاری قەڵەم
لە هەستی هۆشیار، بەربەڵاوترە
تابلۆیی، نەوبەهار
پێم وایە لەبری هەمووی چاترە بڵێی
نەورۆز پیرۆز، لە هەموو کوردێ
چ لە دێ بێ
چ لە شار

## ناوەڕۆک